# پاڵنەرەکانی جەنگ

ئانشتاین و فرۆید

وەرگێڕانی
مەریوان هەڵەبجەی

چرا جنگ ؟

بررسی روانشناسانه پدیده جنگ

مکاتبات البرت انیشتین و زیگموند فروید

ترجمه خسرو ناقد

تهران: نشر ابی ، ۱۳۸۳

***حکومەتی هەرێمی کوردستان***

***وەزارەتی رۆشنبیری***

***بەرێوەبەرایەتی خانەی وەرگێران***

- ناوی کتێب: پاڵنەرەکانی جەنگ
- نووسەر: ئانشتاین و فرۆید
- وەرگێڕانی لەفارسییەوە: مەریوان هەڵەبجەیی
- پیتچنین: وەرگێڕ
- دیزاینی ناوەرۆك و بەرگ: زانا کەمال
- تیراژ: ٧٥٠
- زنجیرە: ١٦٥
- ژمارەی سپاردن (٥١٥) ساڵی (٢٠٠٧)
- چاپ:
- چاپی یکەم

پێشکەشە بەهاوڕێم هەژار ئیبراهیم

## پێشەكی: مەریوان وریا قانع

جەنگ یەكێكە لەو دیاردانەی قووڵ بە مێژووی ئینسانەوە گرێدراوە بە ڕادەیەك هەندێك نووسەر مێژووی ئینسان بەمێژووی دروستكردنی حەمامێكی گەورەی خوێن ناودەبەن. بەڵام ئینسان بۆ جەنگ هەڵدەگیرسێنێت؟ چی وادەكات جەنگ ئەو نەگۆڕە بەردەوامە بێت لەمێژووی مرۆڤایەتیدا؟ ئایا ڕێگایەك هەیە ئینسان لە تارمایی جەنگ ڕزگار بكات؟

لە ساڵی ١٩٣٢ زانای فیزیایی بەناوبانگ ئەلبێرت ئانشتاین نامەیەك لەبارەی جەنگەوە بۆ دەروونناسی گەورە سیگمۆند فرۆید دەنووسێت. لەو نامەیەدا ئانشتاین ئەو پرسیارانەی سەرەوە لە فرۆید دەكاتو داوای وەڵامدانەوەیان دەكات.

نووسینی نامەكە لەسەر داوای یەكێك لە



ئۆرگانەكانی (كۆمەڵەی نەتەوەكان)، (عوسبەت ئەلئومەم) بووە. ئەو ئۆرگانە ویستویەتی ئەقڵە گەورەكانی ئەو ڕۆژگارە بكەونە نامەگۆڕینەوە لەسەر هەر بابەتێك خۆیان بە گرنگی دەزانن بەو هیوایەی ئەوبیروبۆچوونانەی لەو نامە گۆڕینەوانەدا دروستدەبن خزمەتی ئامانجەكانی ئەو ڕێكخراوە بكات كە سەرەكیترینیان بریتی بووە لە بەرقەراركردنی ئاشتیو ئاسایش لە دونیادا.

سەرەتا ئانشتاین نامەكەی بۆ فرۆید دەنێرێت. ساڵێك دواتر نامەكەی ئانشتاینو وەڵامەكەی فرۆید لە پاریس لەیەككاتدا بە زمانی ئینگلیزیو ئەڵمانیو فەرەنسی بڵاودەكرێنەوە، ئانشتاین لە نامەكەیدا لەخۆی دەپرسێت بۆچی جەنگ سەرەڕای هەموو ناشیرینییەكانیو سەرەڕای ئەو هەموو كارەساتەی لێیدەكەوێتەوە، كەچی بەشێكی دانەبڕاوە لە مێژووی ئینسان؟ هەروەها هێما بەوەش دەكات كە

تەکنەلۆژیای کوشتن‌و قەلاچۆکردن بەجۆرێك گەشەی کردووە کە جەنگ ئەتوانێت هەموو مرۆڤایەتی لەناو ببات، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا هەموو هەوڵێك بۆ کۆتایهێنان بە جەنگ مایە پووچبووە. ئانشتاین لەوە ئەدوێت کە ئەوکۆمەڵێك بۆچوونی لەسەر ئەو هەست‌و ویست‌و ئارەزووە قوڵانەی ئینسان هەیە کە دەشێت پەیوەندییان بە جەنگەوە هەبێت، هیواداریشە فرۆید بتوانێت سەرنج‌و تێبینییەکانی خۆی لەسەر بۆچوونەکانی ئانشتاین بنووسێت، هەروەها بە هیواشە فرۆید بتوانێت بیر لە سیستمێکی پەروەردەو فێرکردنی ناسیاسی بکاتەوە کە بتوانێت ئەو بەربەستە سایکۆلۆژیانە لەناو ببات کە وادەکەن ئینسان نەتوانێت واز لە جەنگ بهێنێت.

ئانشتاین بۆ کۆتایهێنان بە جەنگ ڕێگایەك پێشنیار دەکات کە بریتییە لە دامەزراندنی



(دادگایەکی جیهانی باڵا) کە بتوانێت داوەری نێوان ململانێکەرەکان بکات‌و بڕیار بدات لەسەر هەموو ئەو کێشەو گرفتانەی کە ڕووبەڕووی مرۆڤایەتی دەبنەوە. دادگایەك هی هەموو نەتەوەکان بێت‌و کەس بەسەریدا زاڵ نەبێت. بەڵام هەر ئانشتاین خۆی باس لەوە دەکات کە دادگایەکی لەو بابەتە گەرهاتوو خۆی خاوەنی هێزێکی ئەوتۆ نەبێت کە بڕیارو حوکمەکانی لەواقیعدا بسەپێنێت، ئەوا دەکەوێتە ژێر فشارو کاریگەری هێزە دەرەکییەکانەوە. ئانشتاین سەرەڕای ئەوەی کە گومانی هەیە لەوەی شتێکی لەم بابەتە دروستبکرێت، بەڵام بێئومێد نییەو پێیوایە بۆ ئەوەی دادگایەکی لەم بابەتە بتوانێت کار بکات‌و بمێنێتەوە هەر دەوڵەت‌و نەتەوەیەك دەبێت واز لە بڕێك لەسەروەری خۆی بهێنێت بۆ ئەو دادگایە. بەڵام ئانشتاین بەخۆی دەڵێت بەوەی کە هەموو

هەوڵدانێك بۆ دامەزراندنو دروستكردنی دادگایەكی لەمجۆرە تا ئەوكاتە سەركەوتوو نەبووە، دەبێت ڕێگرێكی سایكۆلۆژیو دەروونی قووڵ لە ئینساندا هەبێت كە نەیەوێت كۆتایی بە جەنگو شەڕو شۆڕ بهێنێت. دەبێت میكانیزمێكی دەروونی هەبێت كە نەهێڵێت هەوڵی بنەبڕكردنی جەنگ سەربكەوێت. ئانشتاین خۆی باس لە هەندێك لەو میكانیزمو پاڵنەرانە دەكات، وەك سەرەتاش باس لەو كەمایەتییە لەخەڵك دەكات كە لەهەر كۆمەڵگایەكدا ئامادەیەو كۆی دەسەڵاتەكانی بەدەستەوەیە. ئانشتاین دەڵێت ئەم كەمایەتییە ڕازینابێت سنوورێك بۆ دەسەڵاتی دابنرێت، یان لە پێناوی دەسەڵاتێك لە دەرەوەی خۆیدا لە دەسەڵاتی ئەو كەمبكرێتەوە. ئەم كەمینەیە هەموو شتێك دەكات بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆی قایمبكاتو بپارێزێو زیادبكات، جەنگو بازرگانیكردن بە چەكەوە لەو



ئامرازانەیە كە بۆ ئەم مەبەستە بەكاریدەهێنێت، بەڵام ئەوەی ئانشتاین بەلایەوە شوێنی تێڕامانو بیركردنەوەیە هەڵوێستی زۆرایەتی خەڵكە. ئەگەر كەمایەتی دەسەڵاتدار پێویستی بە جەنگو شەڕوشۆڕ هەبێت، ئەی زۆرایەتی خەڵك ئەمەیان بۆ قبووڵە؟ ئەمە لەكاتێكدا گەر كەمایەتی سوودمەند بێت لەجەنگ ئەوا زۆربە هەمیشە زەرەرو زیانێكی گەورەی لێدەكەوێتو ئازارێكی زۆر دەچێژێت. ئانشتاین خۆی وەڵامی ئەم پرسیارە ئەداتەوە دەڵێت. هۆكارەكە ئەوەیە كە ئەو كەمایەتییە دەستیگرتووە بەسەر سیستمی خوێندنو پەروەردەداو لەو ڕێگەیەوە مێشكو عەقڵی گەنجانو منداڵانی وڵاتەكە دەشۆرنەوەو بەو شێوەیەش دایدەڕێژنەوە كە لەگەڵ سوودو قازانجی ئەو كەمایەتیەدا بگونجێت. هەروەها ئەم كەمایەتییە دەستیگرتووە بەسەر ئۆرگانو ڕێكخراوە

دینییەکانیشداو ئەمانیش بۆ هەمان مەبەست بەکاردەهێنێت. بەڵام ئانشتاین پێیوایە ئەم دوو هۆکارە بەس نین بۆ ئەوەی گەمە بە زۆرایەتی بکرێتو بۆ مەبەستی جەنگکردن بەکار بهێنرێن. ئانشتاین دەڵێت دەبێت هێزێکی دەروونیو ناوەکی لە ئینساندا هەبێت کە بەرەو ڕقلێبوونەوە بیباتو بیکاتە کەسێك حەز لە وێرانکاریو تێکدانو جەنگ بکات. هێزێك لەکاتی ئاساییدا لە ئینساندا نووستووە، بەڵام لەکاتە نائاساییەکاندا دەکرێت بەخەبەر بهێنرێتەوەو ئینسان بەرەو وێرانکاری ببات.ئانشتاین لە کۆتایی نامەکەیدا دواهەمین پرسیار لە فرۆید دەکاتو دەڵێت ئایا دەکرێت بە شێوەیەکی وا کار لە گەشەکردنی دەرونی ئینسان بکرێت کە بتوانێت دژ بەو مەیلو ئارەزووە نەخۆشانە کاربکات کە دەبێتە هۆکاری وێرانکردنو تێشکان.



ئانشتاین دەڵێت مەبەستی لەئینسانیش خەڵکە سادەو نەخوێندەوارەکە نییە، بەڵکو مەبەستی ئەوانەیە کە بە خوێندەوارو ڕۆشنبیرو لێزان ناودەبرێن، چونکە ئەوانن دەکەونە ژێر کاریگەریی ئایدیۆلۆژیا گەورەکانەوەو ئەوانن کە ژیان لە کتێبەکانەوە فێردەبن نەك لە ئەزموونکردنیەوە لە واقیعدا، بەکورتی ئانشتاین لە فرۆید دەپرسێت ئایا دەکرێت دونیا لە ئاشتیو ئارامیدا بژی؟ وەڵامە ناڕاستەوخۆکانی خۆی لەنامەکەیدا تێکەڵێکە لە گومانو ئومێد. لە سەرێکەوە گومانی لەوە هەیە ئینسان بتوانێت کۆتایی بە جەنگ بهێنێت، لە سەرێکی دیکەشەوە هیوایەکی گەورەی هەیە مرۆڤایەتی بتوانێت ئەم کارە جێبەجێبکات. بەڵام وەك دەبینین زیاد لە سێ چارەکە سەدە دوای ئەم هیوایەی ئانشتاین هێشتا دونیا لەناو و لەبەردەم کۆمەڵێك جەنگی گەورەدا ڕاوەستاوە. ئەمڕۆ

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستو بەشێکی گەورەی دونیا حەمامێکی گەورەی خوێنە، ئایا دەکرێت جەنگ کۆتایی پێبهێنرێت؟



## جەنگ وەک دیاردەیەکی دەروونی
## وەڵامی فرۆید بۆ ئانشتاین

لەو نامەیەدا دەربارەی جەنگ بۆ ئانشتاینی دەنووسێت سەرەتا باس لەوە دەکات کە ناتوانێت وەڵامێکی گەشبین بەو پرسیارە بداتەوە کە دەپرسێت: ئایا دەکرێت جەنگ لە مێژووی مرۆڤایەتیدا کۆتاییبێت؟ فرۆید بەر لە نووسینی وەڵامەکەی بۆ ئانشتاین ئەو کەسە دەبینێت کە نامە گۆڕینەوەکەی نێوان ئانشتاینو فرۆیدی ڕێکخستووە، لەو یەکدیبینینەدا فرۆید باسی ئەوە دەکات کە ئەو وەڵامێکی دڵخۆشکەری بەرامبەر بەو پرسیارە نییە، بەڵام ناشیەوێت فێڵ لە خۆیو لە مرۆڤایەتیش بکاتو وەڵامێکی ناڕاستی ئەو پرسیارە بداتەوە. فرۆید بەو پیاوە دەڵێت ئەمە یەکەم جار نییە کە ئەو ڕاستیە تاڵەکان بە مرۆڤایەتی دەڵێت، ئەو بە

درێژایی ژیانی لەو شتانە دواوە کە ئینسانیەت بەلایەوە زەحمەت بووە قبوڵیان بکات، ئێستاش کە پیر بووە نایەوێت فێڵ لە ئینسانیەت بکاتو بەدرۆ پێی بڵێت بەڵێ دەکرێت کۆتایی بە جەنگ لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بهێنێت.

لە سەرەتای نامەکەدا فرۆید باس لەوە دەکات کە پێی سەیر بووە ئانشتاین پرسیاری ئەگەری کۆتاییهاتنی جەنگ لە مێژوودا لەو دەکات، چونکە، وەك فرۆید دەڵێت "لە یەکەم خوێندنەوەمدا ئەوەم بە خەیاڵدا هات کە ئەو پرسیارە پرسیارێکە دەبێت ڕووبەڕووی سیاسیەکان بکرێتەوە نەك زاناکان. بەڵام دواتر بۆم دەرکەوت کە تۆ ئەو پرسیارەت لە خۆشەویستیتەوە بۆ ئینسان کردووە، نەك وەك فیزیاناسێك، دەتەوێت منیش وەك سایکۆلۆژیستێك وەڵامت بدەمەوە نەك وەك کەسێك بەدوای چارەسەرێکی عەمەلیدا بگەڕێت بۆ کۆتایی هێنان



بە جەنگ". بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە دەربارەی جەنگ فرۆید بە باسکردنی ململانێکانی ناو مێژووی مرۆڤایەتی دەست پێدەکات، باس لەوە دەکات کە ئەو ململانێیانە ململانێی هێمن نەبوونو بەردەوام بە شێوازێکی توندوتیژ چارەسەر کراون. بەکارهێنانی هێزو زەبرو توندوتیژی هۆکارێکی سەرەکیبوون لە بەلایەك داخستنو چارەسەرکردنی ململانێکاندا. لەمەشدا ئینسان هەمان ئەو کارە نیشان دەدات کە لە دونیای ئاژەڵاندا ئامادەیە.

فرۆید هێما بۆ ئەوەش دەکات کە هەندێك ناکۆکی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بەبێ بەکارهێنانی توندوتیژی چارەسەر کراوە بەڵام پێی وایە ئەمەیان دیاردەیەکی نوێیەو پەیوەندی بە گەشەو بەرەو پێشچوونی ئینسانو شارستانیەتەوە هەیە. فرۆید دەڵێت "ڕاستە ململانێکانی مێژوو ململانێی جیاوازە، بەڵام جەوهەرەکەیان یەك شتە. هەموو

ململانێ کەرەکان دەیانەوێت ئەو لایەنەی تووشی ململانێ بوون لە گەڵیدا یان بێدەنگ بکەن، یان بیگرن یان بیکوژن. ئەگەر ئینسان دوژمنەکەی بە شێوەیەکی ماتریالی نەکوشتبێت ئەوا هەوڵی ئەوەی داوە ڕۆحی بکوژێت، بە شێوەیەك بیترسێنێت کە نەیەوێت جارێکی دیکە لە بەرامبەریدا هەڵبستێتەوە". بەڵام فرۆید باس لەوە دەکات کە ئەم ستراتیژە هەرگیز بە تەواوەتی سەرینەگرتووە، نە سەرکەوتوو تا کۆتایی سەرکەوتوو بووەو نە دۆڕاویش بە تەواوەتی بۆ هەتاهەتایە دۆڕاوبووە. ئەمەش وایکردووە نە سەرکەوتوو لە ئاسایش‌و دڵنیاییەکی هەمیشەییدا بژی، نە دۆڕاویش. هەردوکیان بە بەردەوامی لەترسی یەکدیدا بژین. بە بۆچوونی فرۆید دروستبوونی یاسا لەمێژووی مرۆڤایەتیدا پەیوەندی بەم ترسە دوو لایەنەوە هەیە. فرۆید دەڵێت "بێگومان گواستنەوە لە



ململانێیەکی ڕووت‌و توندوتیژەوە بۆ یاسا جۆرێك لە پێشکەوتنە، بەڵام یاسا خۆشی بێ توندوتیژی نییە". یاسا وەك فرۆید دەڵێت یاسای هێزە باڵا دەست‌و براوەکانە. یاسا دێت بۆ ئەوەی ژیانی گشتێك یان گروپێك یان کۆمەڵگایەك ڕێکبخات. بەڵام ئەم گشت‌و گروپ‌و کۆمەڵگایە لەناو خۆیدا لە هێزی جیاواز پێکهاتووە کە دەسەڵاتی جیاوازیان هەیە. لاوازو بەهێز، ژن‌و پیاو، بچووك‌و گەورە، ئەمانە کەسانێکن لەڕووی دەسەڵاتەوە نایەکسانن. یاسا شتێکە دەسەڵاتدارەکان دەینووسنەوە. بەڵام یاسا ناتوانێت بۆ هەتاهەتایی کۆتایی بە کاری توندوتیژی‌و پێکدادانی خوێناوی بهێنێت. کاتێك مەسڵەحەتەکان لە یەکدی جیادەبنەوە تەنانەت لەناو یەك گروپدا ئەگەری بەکارهێنانی توندوتیژی ئامادەیە.

فرۆید باس لەوە دەکات کە مرۆڤایەتی

نەیتوانیوە ئایدیالێك دروستبكات كە هەمووان لەدەوری كۆ ببنەوەو وایان لێبكات واز لە جەنگی یەكدی بێنن. تەنانەت لەناو یەك دیندا بەشێك لە باوەڕداران دەچنە جەنگی بەشێكی دی لە باوەڕدارانەوە. بۆیە تا ئەم ساتەش بیركردنەوە لەوەی ئایدیالێك بچێتە شوێنی حەزكردن لە دەسەڵات ئەگەری سەركەوتنی نییە. بە كورتی فرۆید مێژووی جەنگ بەمێژووی دەسەڵاتەوە دەبەستێتەوە، كە تێیدا ویستی دەسەڵاتدارێتی شوێن بەهەر ئایدیالێكی ئینسانی چۆڵ دەكات. بەڵام فرۆید جەنگ تەنها لەم ڕەهەندە كۆمەڵایەتیو سیاسیەدا نابینێت. بەڵكو باس لە بوونی ڕەهەندێكی سایكۆلۆژی غەریزیش دەكات كە ئینسان بەرەو بەرپاكردنی جەنگ دەبات. لەم ئاستەدا فرۆید ڕەگەكانی جەنگ بە ئامادەگی غەریزەیەكەوە دەبەستێتەوە كە ناوی دەنێین "غەریزەی



تێكشكان"، یان "غەریزەی مردن" ئەم غەریزەیەش دیوی ئەودیوی غەریزەیەكی دیكەی ئینسانە كە بریتیە لە "غەریزەی ژین". "غەریزەی ژیان" خۆشەویستی بەڕێوەی دەبات، "غەریزەی مردن" ڕق. فرۆید دەڵێت: "ئەم دوو غەریزەیە بەبێ یەك بوونیان نییە، كەسیشیان لەوی دیكەیان باشتر نین، چونكە ئینسان بەبێ هیچ یەكێكیان ناتوانێت بژی. خودی ژیان خۆشی لەسەر كارلێكو كارلێكی پێچەوانەی ئەم دوو غەریزەیە لەگەڵ یەكدا بەندە".

توندوتیژی یان جەنگ لەم ئاستەدا بەرهەمی كاركردنی غەریزەی مردنە. ئەم غەریزەیە لەو كاتەدا دەبێتە مایەی وێرانكاری كە ئینسان بۆ لەناوبردنی شتێك كە دەكەوێتە دەرەوەی خۆیەوە، بەكاری دەهێنێت. خاڵێكی گرنگ كە فرۆید باسی دەكات ئەوەیە كە هەم غەریزەی ژیانو هەم

غەریزەی مردن دەگوازرێنەوە بۆ ناو كایەی سیاسەت. ژیانی سیاسی دەتوانێت لەسەر گەورەكردنی پانتایی خۆشەویستیو پاراستنی ژیان كاربكات وەك چۆن دەتوانێت لەسەر گەورەكردنو قووڵ كردنەوەی ڕقو وێرانكاری دروست ببێت.

فرۆید دەڵێت بێگومان ئینسان ئەتوانێت بیر لەوە بكاتەوەو هەوڵ بدات غەریزەی ژیان گەورە بكاتو غەریزەی مردن بچووك، هەوڵ بدات هێزی خۆشەویستی لە هێزی ڕق بەهێزتربێت، یان هەوڵ بدات هەردوو غەریزەكە بچنە ژێر دەسەڵاتو توانای عەقڵەوە یان عەقڵ هاوسەنگی نێوانیان ڕاگرێت، بەڵام فرۆید ئەم ئەگەرانە بە ئەگەرێكی یۆتۆپی ناودەبات. ئەوەتەی ئینسان هەیە هەوڵی ئەم شتانە دەدات، بەڵام ئەم هەوڵانە تا ئەمڕۆش بە ئەنجامێكی ڕاستەقینە نەگەیشتوون.

لە كۆتایە نامەكەیدا فرۆید لەوە ئەدوێت تاقە



شتێك كە بە قووڵی دژ بە جەنگو تاقە شتێك كە ئینسان لە بوونەوەرێكی جەنگاوەرەوە بكات بە بوونەوەرێكی دژ بە جەنگ كولتورە، فەرهەنگە. گەشەكردنی كولتور گەشە كردنە دژ بە جەنگ. بەڵام ئایا مرۆڤایەتی چەند كاتی ئەوێت بۆئەوەی ئینسان لە بوونەوەرێكی جەنگاوەرەوە بكات بە بوونەوەرێكی كولتوری؟ فرۆید دەڵێت مەحاڵە بتوانین وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە. بەڵام لەهەمان كاتیشدا پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت كە ئەم گۆڕانكارییە لە ئینسانی جەنگاوەرەوە بۆ ئینسانی كولتوری تاقە ڕێگایەكە بكرێت ئینسان لە نائومێدی ڕزگار بكات.

# دیباچە

ساڵی ١٩٣٢ یە، فاشیستەکان لە ئیتاڵیا دەسەڵاتیان گرتۆتە دەستو لە ئەڵمانیاش حیزبی ناسیۆنال سۆسیالیستی کرێکاری بەڕابەرایەتی ئادۆڵف هێتلەر بە قەیران دروستکردنو ترساندنو لێدانی نەیارانو ئەو کەسانەی کە بەجۆرێکی تر بیردەکەنەوەو دژی دەسەڵاتن، زەمینەی جێگیربوونی سیستەمی تۆتالیریزمی نازیزم فەراهەم دێنێت. لە رۆژهەڵاتی ئەوروپا سیستەمی کۆمۆنیستی بەسەرکردایەتی ستالین بنەماکانی حکومەتی تیرۆرو ترسی خۆی بەسڕینەوەی ناڕازییەکانو رەخنەگرانو دوورخستنەوەو تاراوگەکردنو کوشتنی نەیاران پتەوکردۆتەوە. قەیرانێکی کۆمەڵایەتی بەرفراوانو نالەباری ئابووری هەمەلایەنە ئەمریکای باکوورو بەشێکی زۆری ئەوروپای گرتۆتەوەو ملیۆنان بێکار



لەبارودۆخێکی غەمناکدا رۆژگار دەبەنە سەر. وڵاتی ژاپۆن خاکی مەنوچەری لە باکوری رۆژهەڵاتی چین داگیرکردووەو زۆر لەمێژە مۆسۆلۆنی دیکتاتۆری ئیتاڵیا چاوی تەماعی بڕیوەتە حەبەشە( ئەسیوپیای ئێستا)و لیبیاو باکوری ئەفریقاو ئەلبانیاو ناوچەی بەلقان. سیستەمە تۆتالیتارەکان لەمسەرەوسەری دونیادا بەهێزدەبنو گەشە دەکەن. تارمایی شوومی شەڕ بەڕێگاوەیە.

ساڵی ١٩٣٢یەو هێشتا نە ئەلبێرت ئەنشتاین-ی یەهودی لە ئەڵمانیا دەرکراوەو نە زیگمۆند فرۆید-ی یەهودی لە ئەڵمانیا. ئەنشتاین ئەزموونی بینینی شەڕی یەکەمی جیهانی هەیەو کوشتارو ئاوارەیی هەزاران هەزار مرۆڤو وێرانی شارەکانی بەچاوی خۆی بینیوە. ئەنشتاین بە هۆشیاریو ئاگاداربوونو زانیاری لەبارەی ئەم واقیعیەتە تاڵەی کە ئێستا لەگەڵ پێشکەوتنی زانستو تەکنەلۆژیای نوێ

بەتایبەتی خراپ کەڵکوەرگرتنی وێرانکەر لە تیۆرە زانستییەکانی دەکرێت جیهان بەرەو لەناوچوون بەرێت. ئەنشتاین تووشی عەزابی ویژدان بووەو بەوپەڕی توانا لەدژی روودانی شەڕدا وەستاوەتەوە. لەو ساڵانەدا ناوبانگی ئەنشتاین زۆرتر لەبەرخاتری هەوڵو کۆششە ئاشتیخوازانەکەیەتی نەك تیۆرە زانستییەکانی. ئەنشتاین هاوڕایە لەگەڵ بیرمەندی ئەمریکی(بنجامین فراکلین) کە بڕوای وایە"هەرگیز شەڕێکی چاكو ئاشتییەکی خراپ بوونی نەبووە". ئەنشتاین هەستی بەمەترسیو روودانی شەڕێکی جیهانی نوێ کردووە.

لە مانگی یەکی ساڵی ١٩٣٢دا هێشتا دامەزراوەیەك بەناوی رێکخراوی (نەتەوە یەکگرتووەکان)دانەمەزراوە. (کۆمەڵەی نەتەوەکان) کەلەسەرەتای ساڵی ١٩٢٠ەوە دامەزراوە هەموو وڵاتانی جیهانی لەخۆ نەگرتووە، نە ویلایەتە



یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەندامە تیایدا، نە رووسیای سۆڤێتیو نە بەرازیل، نە میسرو ...هتد. تەنها چلوپێنج وڵات لەکۆمەڵەی نەتەوەکاندا کە بارەگاکەی لە جنێفە، ئەندامن. ژاپۆنو ئەڵمانیا لەساڵی ١٩٣٣داو ئیتاڵیا دوو ساڵ دواتر ئەم رێکخراوە بەجێدەهێڵن. نەبوونی هێزو توانای پێویست بۆ بەرگری کاریگەر لەبەرامبەر دەستدرێژە داگیرکەرییەکانی هەندێك لە وڵاتەکان ـ لەوانە ژاپۆن، ئەڵمانیا، ئیتاڵیا، رووسیای سۆڤێتی ـ بەشێوەیەکی بەرچاو لەبایەخو دەسەڵاتی کۆمەڵەی نەتەوەکانی کەمکردۆتەوە. ئەم رێکخراوە لەکاتی روودانی شەڕی جیهانی دووەمدا کە لەڕاستییدا بە دەستدرێژیکردنی ئەڵمانیا بۆ سەر پۆڵەندا لە ساڵی ١٩٣٩دا دەستی پێکرد نەیتوانی هیچ جۆرە هەڵوێستێك دەرببڕێتو بووە بینەری یەکێك لە کارەساتبارترین رووداوەکانی مێژووی مرۆڤ...

لەو ساڵانەدا بزوتنەوە ئاشتیخوازەکان بەوجۆرەی کە ئەمڕۆ لە دنیادا بەتایبەت لە ئەوروپای رۆژئاواو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چالاکییان هەیە؛ نەبوو. تەنیا کەمینەیەك لەو کەسانەی ئازادانە بیردەکەنەوەو ئاشتیخوازن‌و بەدوای رێگەچارەوە بوون تا رای گشتی جیهان لەدژی شەڕو شەڕخوازی ئامادە بکەن. لەناو ئاشتیخوازەکانی ئەو دەمەشدا ئەلبێرت ئەنشتاین یەکێك بوو لە شێلگیرترین‌و چالاکترین نەیارانی شەڕ.

٣٠ جەنیوەری ساڵی ١٩٣٢ـە، ئەنشتاین‌و هاوڕێکانی(بێرتراند راسڵ، رۆمەن رۆلان، ئیشتیڤان تسوایك، کارل فۆن ئۆسیتیسکی)و کەسانی تر بڕوایان وایە گروپێکی نێونەتەوەیی لە زانایان‌و نووسەران‌و رۆشنبیرانی جیهان دەتوانن لەبەرامبەر نابەرپرسیارێتی دەسەڵاتدارانی سیاسی، رای گشتی جیهان لەدژی شەڕخوازی‌و بڵاوبوونەوەی چەك‌و



تەقەمەنی هانبدەن. لەبەدواداچوونی ئەم کارانەدا بوو کە ئەلبێرت ئەنشتاین سەرەڕای ئەوەی کە بڕوایەکی ئەوتۆی بە دەروونناسی نەبوو، لە نامەیەکدا کە بۆ زیگمۆند فرۆیدی نووسی داوای لێدەکات تا پرسی بەرگیریکردن لەشەڕ لە روانگە دەروونناسییەوە لێکبداتەوە.

ئەنشتاین وەك زانایەکی زانستە سرووشتییەکان بەدوای رێگا چارەیەکی پراکتیکی بۆ پێشگرتن لە ڕوودانی شەڕ دەگەڕێت. ئەنشتاین کە راهاتووە بە بەڵگەهێنانەوەی بەراوردکاری ورد، هیوادارە بە داڕشتنی تیۆریی‌و خستنەڕووی بەڵگەی زانستی بەهێز نەك تەنها ئارەزووی مرۆڤەکان بۆ بەشداریکردن لە شەڕدا لاوازبکات بگرە بتوانێت بەگشتی نەیهێڵێت. ئەنشتاین لە نامەکەیدا بۆ فرۆید کە رێکەوتی ٣٠ی مانگی یەکی ١٩٣٢ـی لەسەرە، بە ئەم پرسیارە دەستپێدەکات:"ئایا

لەبەرامبەر کارەساتی شوومی شەڕدا ڕێگایەك بۆ ڕزگاربوونی مرۆڤایەتی هەیە ؟"..

ئەنشتاین خۆی لەخۆیدا مرۆڤێك بوو ئازادانە بیریدەکردەوەو بە مانای واقیعی وشە هاوڵاتییەکی جیهانی بوو. جا هەربۆیە ئیحساساتو هەڵچوونی ناسیۆنالیستی نەبوو. هەر بەم هۆیەوە پێیوابوو لایەنەکانی پرسی دامەزراوەی بەرگیریکردن لەشەڕ سادەو ساکارە. بۆچوونەکانی ئەنشتاین لەبارەی دروستکردنی دامەزراوەیەکی جیهانی بۆ نەهێشتنی ناکۆکییە نێو نەتەوەییەکان، زۆر نزیکە لە ڕێکخراوی(نەتەوە یەکگرتووەکان) واتە ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٤٥دا دروست بوو و تاوەکو ئەمڕۆ ماوەتەوە. بەڵام ئێمە دیمان ئەم دامەزراوە زۆر گەورەیەش لە شەش دەیەی رابوردوودا نەیتوانی ڕێگا لەشەڕو پێکدادانی خوێناوی ناوچەییو جیهانی بگرێت. بەڵام چەندینجار بینیومانە کە ڕێکخراوی نەتەوە



یەکگرتووەکانو ئەو دامەزراوانەی کە پەیوەستن پێوەی لەگەڵ هەموو ئەو کۆششەی کە بەمەبەستی چارەسەرکردنی ئاشتیخوازانەی ناکۆکییەکانی نێوان ئەو حکومەتانەی کە دژی یەکن ئەنجامیانداوە دیسان بوونی دەسەڵاتی زۆرو پێداگرتنی ئەم یان ئەو وڵاتی دەسەڵاتدار یان ڕەفتاری زۆردارانەی حکومەتە دیکتاتۆرەکان لەمسەرەوسەری دونیادا هەموو پەسەندکراوەکانی لیژنەی گشتیو ئەنجومەنی ئاساییشی نەتەوەیەکگرتوەکانی ناکاریگەر کردووەو دیسانەوە وەکو فرۆید دەڵێت ئەوە" زۆر"ە کە زاڵ بووە بەسەر"مافە نێونەتەوەییەکاندا".

پێموایە لێکدانەوە کورتەکەی فرۆید لەبارەی زۆرو مافو بەلگەهێنانەوەی لەم بارەیەوە، هێشتا هەر بەشایستەیی ماوەتەوە.

بە تایبەت ئەمڕۆ کە ئێمە بێهێزی نەتەوە

یەکگرتووەکانو تەنانەت دەستەوستانی زۆربەی ئەندامانی لە بەرەنگاربوونەوەی بەکاربردنی زۆرو پەلامارو راووڕووتی ئەندامە زۆردارەکانی دەبینین. پەیدەبەین بە وتەکانی فرۆیدو بێهیوابوونی لە رۆڵو دەسەلاتی دامەزراوەی وەك (کۆمەڵەی نەتەوەکان) بۆ بەرگیریکردن لە رووداوی شەڕ لەو سەردەمەدا تێدەگەین دیارە ئەنشتاین لەو سەردەمەشدا بە خستنەڕووی تیۆرەکانی بە باشی ئاگاداری بێتوانایی رێکخراوەییو ئەو رێگرانەبووە کە لەسەر رێگای دامەزراندنی وەها رێکخراوێکدا هەبوو. لەم رووەوەیە کە ئەمجارە پرسیاری"شەڕ بۆچی؟" لەگەڵ پسپۆڕی زانستی دەروونناسییو دامەزرێنەری دەروونشیکاریی نویٚ خستۆتە بەر باسو لەلای ئەو بەدوای رێگەچارەی بەرگرتن لە شەڕدا دەگەڕێت.

خوێنەری ئەم نامەیە زیگمۆند فرۆیدە. فرۆید



چەندین ساڵ لەوەو پێش بۆچوونەکانی خۆی لەبارەی شەڕەوە لە چەند وتارێکدا خستبووەڕوو. فرۆید لە مانگی مارتو ئاپرێلی ساڵی ١٩١٥داو رێك شەش مانگ پاش دەستپێکردنی شەڕی یەکەمی جیهان لە دوو وتاردا بەناونیشانی(بێزاری لە شەڕ)و (پەیوەندی ئێمە لەگەڵ مەرگ) بۆچوونەکانی خۆی لەبارەی دیاردەی شەڕو مەرگ خستەڕوو. ئەم دوو وتارە دواتر لەکۆی بەرهەمەکانیداو لەژێر ناونیشانی(باسگەلێکی نویٚ دەربارەی شەڕو مەرگ) چاپکرا..(٣)

فرۆید بە پێچەوانەی ئەنشتاین-ەوە، بە کاربردنی عەقڵو بەلگەهێنانەوەی لۆژیکی بەڕێگایەکی چاك نازانێت بۆ رێنمایی گەشەی دەروونی مرۆڤەکان بەمەبەستی بەرنگاربوونەوە لەگەڵ شەڕدا. فرۆید لەو بڕوایەدایە کە مەعقولترینو وردبینترینو زیرەکترین مرۆڤەکانیش

لە بارودۆخێكدا دەبنە كۆیلەو ژێردەستەی ئیحساساتو غەریزەكانی خۆیان. فرۆید ئامادەبوونی ئارەزوومەندانەی مرۆڤەكان بۆ بەشداریكردن لە شەڕدا بەهۆی بوونی غەریزە وێرانكەرەكانەوە بەئاسان دەزانێتو نەك تەنیا هیوای بە نەمانی تەواوەتی ویستی شەڕانگێزانەی مرۆڤ نییە، بەڵكو بوونی ئەو غەریزەیە بە پێویست دەزانێت بۆ بەردەوامیدان بە ژیان. زیگمۆند فرۆید لەسەرەتای وەڵامەكەیدا كە بۆ ئەنشتاینی دەنووسێت ئاماژە بەوە دەكات كە لەڕاستییدا خوێنەرانی سەرەكی پرسیاری"شەڕ بۆچی؟" بەرپرسانو دەسەڵاتدارانی حكومەتەكانی دونیان نەك ئەو. بەڵام دواتر رازی دەبێت تەنیا لەسنووری زانستی خۆیدا(واتە لەڕووی زانستی دەروونناسییەوە) لەبارەی بەرگرتن لەشەڕ بدوێتو لەهەمانكاتدا ئاماژە بەوە دەكات كە نابێت



چاوەڕوانی ئەوەی لێبكرێت تا پێشنیازی پراكتیكی لەمبارەیەوە بخاتەڕوو.

بەڵام ئەوەی كە لە لێكدانەوەكانی فرۆیددا بۆ ئێمە زیاتر لە لایەنەكانی مافو رێكخراوەیی پرسی شەڕ بەبایەخو سەرنجڕاكێشترە، شارەزاییە لەبارەی بۆچوونو بیركردنەوەی ئەوەوە وەك زانایەكی ئاشنا بە غەریزە مرۆییەكان. ئەنشتاین لە پرسیارەكانی خۆیدا لە فرۆید، ئاماژە بە خاڵێك دەكات كە وەڵامی فرۆید بۆ ئەو لەڕاستییدا دەستپێكی لێكدانەوەی دەروونناسانەی ئەوە لەبارەی دیاردەی شەڕەوە، واتە ئەو شتەی كە ئەنشتاین ئارەزوومەندە بیناسێتو هیوادارە لەم رێگایەوە بەرێگا چارەیەك بگات بۆ بەرگرتن لە روودانی شەڕ. لەڕاستییدا هەردووكیان بڕوایان وایە كە نابێت تەنیا لە دنیای سیاسەتو ئابووریدا بەدوای هۆكارە سەرەكییەكانی روودانی دیاردەی شوومی شەڕدا بگەڕێین، بێگومان

دەسەلاّتخوازیو زۆرخوازیو حەزکردن لە قۆرخکردنی سەرمایەی ئابووری دونیا لەلایەن دەسەلاّتە گەورەو بچووکەکانەوە یەکێکە لە هۆکارەکانی روودانی شەڕەکان. بەلاّم لەگەلّ ئەوەدا دیاردەی شەڕ لەمانەش ئالۆزترە.

بەهەرحالّ نامە گۆڕینەوەی ئەلبێرت ئەنشتاینو زیگمۆند فرۆید بەم دوو نامەیە کۆتایی نایەت، بەلاّم بەهۆی ئەوەوە کە ئەنشتاینو هاوڕێکانی بێهیوا دەبن لە راکێشانی فرۆید بۆناو (کۆمەڵەی نێونەتەوەیی رۆشنبیران) پاش نووسینی چەند نامەیەکی تر کۆتایی دێنێت بە نامەگۆڕینەوەکانی لەگەلّ فرۆیددا. نامەنووسینەکانی دواتری ئەم دوو کەسە بابەتگەلێکی گرنگو بەبایەخی ئەوتۆی تێدا نییەو تەنیا ئەم دوو نامەیەی کە لەم کتێبەدا هاتوون وەك دەقێکی بە بایەخو بەلگەیەکی بەبەها جێگەی سەرنجە.



کتێبی شەڕ بۆچی؟(٤) لەساڵی ١٩٣٣دا بە کۆششی ئەنستیتۆی نێونەتەوەیی هاوکارییە مەعنەوییەکان بۆ یەکەمجار بە زمانی ئەلّمانی لە پاریس چاپکرا. دواتر بە زمانی ئینگلیزیو فەرەنسیو هۆلّەندی چاپکرا. ئەم کتێبە بچکۆلەیە لەم ساڵانەدا وەرگێڕدراوەتەسەر هەموو زمانە رۆژئاواییەکانو چاپکراوە..

**خەسرەو ناقد**

**هاوینی ٢٠٠٤**

## دەنگی ئاشتیخوازیی
## ئەلبێرت ئەنشتاین

ئەگەر سەرچاوەو گەنجینەکانی جیهان بە چاکی دابەشدەکران، ئێمەش وەك کۆیلەکان دیلی دەستی تیۆرییەکانو نەریتە سەرسەختە ئابوورییەکان نەدەبووین. بێگومان بەڕادەی پێویست هەم پارەو هەم کارو هەم خۆراك بۆ هەمووان دەبوو. بەڵام لەپێش هەموو شتێك، نابێت ئیزن بدەین بەرگیری بکرێت لە ئەندێشەو تێکۆشانە دروستکەرو بەکەڵکەکانی ئێمەو بەکەڵکوەرگرتنی خراپ لە چالاکییەکانی ئێمە ئامادەکاریی بۆ شەڕێکی نوێ بکرێت. منیش هەروەك بیرمەندی گەورەی ئەمریکایی (بنجامین فرانکلین) بڕوام وایە"هەرگیز شەڕێکی چاكو ئاشتییەکی خراپ بوونی نەبووە".

من نەك هەر ئاشتیخوازم، بەڵکو ئاشتیخوازێکی



خەباتگێڕم کە بۆ بەرقەراربوونی ئاشتی بە هەموو توانامەوە خەباتدەکەم. هیچ شتێك ناتوانێت شەڕ لەناوبەرێت، مەگەر ئەوەی کە مرۆڤەکان خۆیان نەڕۆنە بەرەکانی شەڕەوە، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجە گەورەکان، سەرەتا کەمینەیەکی خەباتگێڕ تێدەکۆشێت.

ئایا باشتر نییە لە ڕێگەی ئاشتییدا کە بڕوامان پێیەتی ئازارو زەحمەت بکێشین تا لە شەڕدا، کە باوەڕمان پێی نییە لەناو بچین؟

هەر شەڕێك بازنەیەکە کە بۆ زنجیری بەدبەختییەکانی مرۆڤ زیاد دەبێتو دەبێتە ڕێگر لەبەردەم گەشەکردنیدا. لەمڕووەوە سەرپێچی ژمارەیەکی هەرچەندە کەم بۆ بەشداریکردن لە شەڕدا، دەتوانێت نیشاندەری ناڕەزایەتی گشتی بێت بەرامبەر بە شەڕ. جەماوەر؛ ئەگەر نەکەونە بەر پڕوپاگەندەی ژەهراویی، هەرگیز شەڕیان پێخۆش

نییە. دەبێت جەماوەر لەبەرامبەر ئەم راگەیاندنەدا بپارێزرێت. دەبێت رۆڵەکانمان لە بەرامبەر میلیتاریزمدا بکوتین (بۆئەوەی تووشی ئەم پەتایە نەبن)، ئەم کارەش کاتێك دەکرێت کە رۆڵەکانمان بەرۆحی ئاشتیخوازی پەروەردە بکەین. بەداخەوە نەتەوەکان بە ئامانجگەلی هەڵە پەروەردەکراون. لە کتێبەکانی سیستەمی پەروەردەدا رێز لە شەڕ دەگرن‌و ترس‌و وێرانکارییەکانی لەبەرچاو ناگرن‌و لەم رێگەیەوە رقەبەرایەتی‌و دوژمنایەتی‌و تۆڵەکردنەوە فێری منداڵان دەکەن. بەڵام من دەمەوێت فێری ئاشتی بم نەك نەفرەت، فێری عەشق بم نەك شەڕ. پێویستە کتێبەکانی سیستمی خوێندن‌و پەروەردە سەرلەنوێ بنووسرێنەوە؛ تا بتوانن لەحیاتی درێژەدان بە ناکۆکییە کۆن‌و هەمیشەییەکان‌و هێنانەکایەی حوکمی پێشوەخت‌و نابەجێ، رۆحێکی تازە بکەن بەبەر سیستەمی



فێرکاریی‌و پەروەردەماندا. پەروەردە لەبێشکەوە دەستپێدەکات‌و لە ئەستۆی دایکانی دونیادایە کە منداڵەکانیان ئاشتیخواز پەروەردەبکەن‌و فێریان بکەن ئاشتییان خۆش بوێت. دیارە مەحاڵە غەریزە شەڕخوازەکان لە سنووری نەوەیەکدا لەناو ببرێت، تەنانەت شایستەش نییە کە ئەم غەریزەیە بە گشتی لەناو ببرێت. مرۆڤەکان دەبێت بەردەوام خەبات بکەن، بەڵام خەبات لەرێگەیەکی بەبایەخدا، نەك لە چوارچێوە وەهمیی‌و خەیاڵییەکانداو بەدەمارگیری رەگەزیی‌و پاڵنەری زۆرخوازی کە زیاتر لەژێر ئاڵای نیشتیمانپەروەرییدا روودەدات. **چەکی ئێمە عەقڵی ئێمەیە نەك تۆپ‌و دەبابە.**

**دەمانتوانی چ جیهانێکی جوان دروستبکەین؛ ئەگەر هەموو ئەو توانایانەی کەلە شەڕێکدا بەفیڕۆدەچن لە خزمەتی ئاوەدانکردنەوەدا بمانخستنایەتەکار!!** یەك لە دەی ئەو توانایانەی کە

لە شەڕی یەکەمی جیهانیو بەشێکی کەم لەو سەروەتەی کە بۆ بەرهەمهێنانی چەكو تەقەمەنیو گازی ژەهراوی لەناوچوو بەس بوو بۆئەوەی ژیانێکی شایستە بۆ مرۆڤەکانی ئەو وڵاتانەی کە تووشی شەڕ بوون پێکبهێننو بەر بە کارەساتی برسیەتیو بێکاریی بگیرێت، بەڵام ئێمە ئەمڕۆ هەر بەو رادەیەی کە بۆ شەڕ لەخۆبوردوویيو گیانبەختکردنمان نیشاندا، دەبێت لەڕێگەی ئاشتیشدا ئامادەی فیداکاریی بین. هیچ شتێك بۆ من لە پرسی ئاشتی گرنگتر نییە. جگە لەمە هەرچی کە دەیڵێمو هەرچی ئەوەی کە ئەنجامیدەدەم ناتوانێت پێکهاتەی جیهان بگۆڕێت، بەڵام رەنگە دەنگی من بتوانێت لە خزمەتی کارێکی گەورەدا بێت، دەنگێك کە هاواردەکاتو یەکێتی مرۆڤەکانو ئاشتی دەوێت لە جیهاندا.

**ئەلبێرت ئەنشتاین**



## نامەی ئەنشتاین بۆفرۆید

**بەڕێز فرۆیدی ئەزیز** ...

خۆشحاڵم کە کۆمەڵەی نەتەوەکانو (ئەنستیتۆی نێونەتەوەیی هاوکارییە مەعنەوییەکان) ئەم رێکخراوە لە پاریس، بواری راگۆڕینەوەی بۆ رەخساندم لەگەڵ کەسێكو لەبارەی پرسێکەوە کە پێمخۆشە. من ئەم دەرفەتە ناوازەیە دەقۆزمەوەو حەزدەکەم پرسێك لەگەڵ تۆدا بخەمە بەر باس، کە بەبۆچوونی من لە دۆخی ئێستادا گرنگترین پرسی شارستانییەتی مرۆییە: ئایا لەبەرامبەر کارەساتی شوومی شەڕدا رێگایەکی رزگاربوون هەیە بۆ مرۆڤایەتی؟ ئەم پرسیارە، دوابەدوای پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا بۆتە پرسێکی زۆر سەرەکی بۆ مرۆڤی شارستانییو لەگەڵ ئەوەشدا هەمووان ئاگاداری ئەم بابەتەن، بەڵام تا ئێستا هەموو کۆششەکان بە

مەبەستی چارەسەرکردنی ئەم پرسە بەجۆرێکی ترسناك بە شکستیانهێناوە.

من بڕوام وایە تەنانەت ئەو مرۆڤانەی کە بە کردەوە یان بەپێی پیشەکەی خۆیان، پەیوەندییان بەم پرسەوە هەیە، لەڕووی هەستکردن بە بێتوانایی‌و بێئیمکانییەتییەوە، ئارەزوومەندن ئاگاداری روانگەی کەسانێك بن کەلەبەر چالاکییە هەمیشەییە زانستییەکانیان، ئاشنایەتییەکی فراوانتریان لە هەموو بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیانی مرۆڤ بەدەستهێناوە. تا ئەوجێگایەی کە پەیوەندی بە منەوە هەیە، بازنەی ئاسایی بیرکردنەوەی من ناهێڵێت‌و بواری ناسینی قوڵایی ئیحساسات‌و پێویستییە مرۆییەکان نادات. بەناچار لەم راگۆڕینەوەیەدا ناتوانم هیچ کارێك بکەم جگە لەوەی ئەو پرسیارەی کە مەبەستمە بەجۆرێکی بەرفراوانتر ئاراستە بکەم‌و پێش هەموو شتێك



هەوڵبدەم تا بە خستنەڕووی رێگەچارە رواڵەتییەکان، ئەو دەرفەتەت بۆ بڕەخسێنم تا لەسەر بنەمای ئەو ئاشناییە قوڵەی کە لەبارەی غەریزەکانی مرۆڤەوە هەتە، لێکدانەوەی پرسەکە بکەیت.

دڵنیام کە تۆ دەتوانیت لە رێگەو شێوازە پەروەردەییەکانەوە دەستنیشانی ئەو کۆمەڵە کۆسپ‌و رێگرە دەروونییانە بکەیت کە بەجۆرێکی تاڕاددەیەك نا سیاسی دەکرێت نەهێڵدرێن، ئەو کۆسپ‌و رێگرانەی کە کەسی نەشارەزا بە پرسەکانی دەروونناسی، بوونیان هەستپێدەکات، بەڵام ناتوانێت لەبارەی رێژەو قابیلیەتی گۆڕانیانەوە داوەری بکات.

لەبەرئەوەی کە من خۆم دوورم لە ئیحساسات‌و ورووژانە ناسیۆنالیستییەکان‌و مرۆڤێکی ئازادم، لایەنە رواڵەتییەکان، یان بەواتایەکی باشتر لایەنە رێکخراوەییەکانی پرسەکە ساکار دێتە بەر چاوم:

حکومەتەکان دامەزراوەی یاسادانانو دادوەری بەمەبەستی چارەسەرکردنی هەموو ئەو ناکۆکییانەی کە لە ئارادایە دروستدەکەنو بەرپرسیارێتی لە ئەستۆ دەگرنو بەڵێن دەدەن کە پەیڕەوی بکەن لە هەموو ئەو یاسایانەی کە یاسادانەران پەسەندیدەکەن. سەرەڕای ئەمانەش ئەرکە لەسەریان لەکاتی سەرهەڵدانی ناکۆکییدا پەنابەرنە بەر دادگا نێونەتەوەییەکانو بڕیارەکانیان بەبێ هیچ مەرجێك جێبەجێبکەنو ئەو ڕێوشوێنانەی کە دادگا بۆ هێنانەدی بڕیارەکانی بەپێویستی دەزانێت، جێبەجێبکەن. بەڵام ئێمە لێرەدا رووبەڕووی یەکەمین کێشە دەبینەوە: دادگا دامەزراوەیەکە لە مرۆڤەکان پێکهاتووەو تا دەسەڵاتی کەمتریان لە ئیختیاردا بێت بۆ ئەوەی بڕیارەکانیان جێبەجێبکەن، ئەگەری کاریگەربوونی بە هۆکارو فاکتەرە نایاساییە دەرەکییەکانی تیا



زیاتر دەبێت. جیانەبوونی مافو دەسەڵات راستییەکی حاشاهەڵنەگرە. کاتێك بۆچوونی دامەزراوەیەکی یاسایی نزیکدەبێتەوە لە دادپەروەری کۆمەڵگە کە بەناو و لە بەرژەوەندی هەمووان بێت، تا ئیختیاراتی کۆمەڵگە زیاتر بێت، دەتوانێت ڕێزگرتن لە دادپەروەری پەسەندی خۆی بە ئەوانی دی بقەبوولێنێت.

بەڵام ئێمە لە ئێستادا خاوەن دامەزراوەیەکی بان-دەوڵەتی وا نین کە دەسەڵاتێکی حاشاهەڵنەگر بداتە دادگاکانیو بڕیارەکانیان جێبەجێبکات. بەناچار یەکەمین ئەنجام کە لەم باسەدا بەدەست دێت ئەوەیە کە تەنیا ڕێگەی بەدەستهێنانی ئاسایشی جیهانی، چاوپۆشی بێمەرجی حکومەتەکانە لە بەشێك لە ئازادی کارو مافی فەرمانڕەوایەتییان. بێگومان ڕێگەیەکی تر نییە بۆ بەدەستهێنانی ئاسایشی جیهانی.

به چاوخشاندنێك بەو هەوڵو تێكۆشانە جددیو لەهەمانكاتدا بێئەنجامانەدا كە لەم چەند دەیەی دواییدا بەمەبەستی گەیشتن بە ئەم ئامانجە ئەنجامدراوە، دەكرێت هەست بەو هێزە گەورە دەروونییانە بكەین كە ئەم كۆششانە لەباردەبەنو ناكارایان دەكەن. هەندێك لەم هێزانە بە ئاشكرا دەناسرێنەوە. دەسەڵاتخوازیی توێژی دەسەڵاتدار لەهەر وڵاتێكدا دژی سنووردارکردنی مافی فەرمانڕەوایەتییەكەیەتی. ئەم دەسەڵاتخوازاییە سیاسییە زۆرجار بە تێكۆشانی دەسەڵاتخوازانەی(ماددی ـ ئابووری) توێژێكی تر لە كۆمەڵگەدا تێكەڵ دەبێتو زیاتر دەبێت. مەبەستم ئەو گرووپە بچووكە، بەڵام خاوەندەسەڵاتو بڕیارەیە لە هەر كۆمەڵگەیەكدا كە گوێ ناداتە بەها كۆمەڵایەتییەكانو، شەڕو بەرهەمهێنانو كڕینو فرۆشتنی چەك هیچ مانایەكی نییە بۆیان جگە



لەبەرژەوەندی تاكەكەسیو فراوانبوونی بازنەی دەسەڵاتیان.

ئەم راستییە ساكارە هەنگاوی یەكەمە لەناسینی ئەو پەیوەندییانەی كە مەبەستمانە. ئێستا ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە كە چۆن ئەم كەمینە بچووكە دەتوانێت كۆمەڵانی خەڵك بەمەبەستی بەدەستهێنانی ویستو ئارەزووەكانی خۆی بەكاربهێنێتو بیانخاتە خزمەتی خۆی؟ خەڵكانێك كە لەشەڕدا تەنها بەشیان رەنجو ماڵوێرانییە!. كاتێك من لەبارەی كۆمەڵانی خەڵكەوە دەدوێم مەبەستم ئەو كەسانەشە كە وەك سەرباز بە پلەوپایەی جۆراوجۆرەوە شەڕیان كردووە بە پیشەی خۆیان، بەو باوەڕەی كە لەم رێگەیەوە بە باشترین شێوە لە خزمەتی بەرگری لەبەرژەوەندییەكانی میللەتەكانی خۆیانداو تەنانەت لەهەندێك حاڵەتدا بڕوایان وایە دەستدرێژیكردن باشترین

جۆری بەرگرییە. یەکەم وەڵام کە دەکرێ بۆ ئەم پرسیارە دابنرێت ئەمەیە کە کەمینەی فەرمانڕەوا لەهەر کۆمەڵگەیەکدا، دامەزراوەی وەك قوتابخانەکان، ماسمیدیاو تەنانەت لە زۆر کاتدا دامەزراوە مەزهەبییەکانیشی لە ئیختیاردایەو بە کەڵکوەرگرتن لەم دامەزراوانە فەرمانڕەوایی دەکات بەسەر ئیحساساتی ژمارەیەکی ئێجگار زۆری خەڵکداو دەیانکات بە ئامرازێکی بێئیرادە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی. بەڵام ئەم وەڵامەش روونکەرەوەی هەموو پەیوەندییەکانی ئێستا نییە، لەبەرئەوەی لێرەدا پرسیارێکی تر دێتە پێشەوە کە بۆچی جەماوەر بوار دەرەخسێنن کە بەهۆی ئەو ئامرازانەی کە باسکران، تا سنووری شێتیو تووڕە بوونو قوربانیبوون بیانبەن؟ تەنیا وەڵامێك کە دەکرێت بەو پرسیارەی سەرەوە بدرێتەوە ئەوەیە کە لە دەروونی مرۆڤەکاندا پێویستی بە نەفرەتو



لەناوبردن هەیە. ئەم نەخۆشییە لە حاڵەتی ئاساییدا شاراوەو خەوتووە، بەڵام لە کاتە نائاساییەکاندا دەردەکەوێتو دەکرێت تاڕاددەیەك بە ساکاری بجوڵێنرێتو ببێتە شێتییەکی جەماوەریی. وا دەردەکەوێت کە کرۆکی پرسەکە بە گشتی لە ئاڵۆزی کاریگەری ئەم باوەڕە شوومەدا خۆی مەڵاسداوە. ئێستا گەیشتینە ئەو خاڵەی کە تەنیا کەسێك دەتوانێت ئەم پرسە لێکبداتەوەو چارەسەری بکات کە غەریزەکانی مرۆڤ بناسێت.

دوایین پرسیار کە ماوەتەوە بیکەین؛ ئەوەیە کە ئایا بواری رێنمایی گەشەی دەروونی مرۆڤ بەمەبەستی ئەوەی توانای بەرەنگاری لەگەڵ شێتییو نەخۆشیو نەفرەتو لەناوبردندا هەبێت، هەیە؟ لێرەدا بە تەنیا مەبەستم خەڵکی ئاساییو رەشۆکیی نییە، بەڵکو بەپێی ئەزموونەکانی ژیان، هەر ئەم بەقەرار رۆشنبیرانەن بە ئاسانی دەکەونە

ژێر کاریگەری قبوڵکردنی بیروباوەڕی گشتگیر، لەبەرئەوەی ئەمانە راستەوخۆ لە ئەزموونە رۆژانەکانی ژیانی خۆیان ئیلهام وەرناگرن، بەڵکو بەئاسانیو بە تەواوی رادەکێشرێن بۆئەوەی کە لەسەر کاغەز نووسراوە.

لەکۆتاییدا دەبێت ئەوەش بڵێم کە من لێرەدا تەنیا دەربارەی شەڕی نێوان حکومەتەکان، واتە ناکۆکییە نێونەتەوەییەکان دوام، بەڵام ئاشنایەتییم لەگەڵ ئەو هێرشکردنو شەڕەنگێزییانەی کەبە چەشنی جیاوازو لەبارودۆخی جۆراوجۆردا دروستدەبێت هەیە، بۆنموونە :(شەڕە ناوخۆییەکان کەلە رابووردوودا هۆکاری مەزهەبییان هەبووەو ئەمڕۆ بە هۆکاری کۆمەڵایەتییەوە سەرهەڵدەدەن یان راوەدوونانو چەوساندنەوەی کەمینە نەتەوەییەکان). بەڵام لێرەدا هۆشیارانە، یەکێك لەبەرچاوترینو کارەساتاویترین چەشنەکانی ناکۆکی



نێوان کۆمەڵگە مرۆییەکانم خستە ڕوو بۆئەوەی بکرێت چۆنیەتی بەرگرتن لەناکۆکییەکی دوژمنانە باشتر پیشان بدرێن.

دەزانم تۆ لە نووسینەکانتدا بەشێوەیەکی راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ وەڵامی هەموو پرسە گرنگو سەرەکییەکانی ئێمەت داوەتەوە، بەڵام ئەگەر جارێکیتر لەسەر بنەمای ئاشنایەتی نوێی خۆت بەشێوەیەکی تایبەت لە پرسی رزگاربوونی جیهان لەشەڕ بکۆڵیتەوە، زۆر بەکەڵك دەبێتو دەتوانێت کۆششی سوودبەخشی دیکە بەدوای خۆیدا بهێنێت.

**لەگەڵ سڵاوی هاوڕێیانەدا**

**ئەلبێرت ئەنشتاین**

**١٩٣٢/٢/٣٠**

## وەڵامی فرۆید بۆ ئەنشتاین

**بەڕێز ئەنشتاینی ئازیز..**

کاتێك کە بیستم منت بۆ راگۆڕینەوە دەربارەی بابەتێك هەڵبژاردوە کە بایەخی هەیە بۆتو پێتوایە بۆ خەڵکانی دیکەش گرنگو سەرنجڕاکێشە، بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە رازیبوونی خۆم راگەیاند. من چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد کە تۆ بابەتێك هەڵبژێریت لە سنووری زانستی نوێدا بێتو هەرکەسێك، چ فیزیا ناسێكو چ دەروونناسێك، تاڕادەیەك بتوانێت لەبارەیەوە بیروبۆچوونی خۆی دەربڕێتو لەچەند لایەنێکی جیاوازەوە بگەنە زەمینەیەکی هاوبەش. بەڵام خستنەڕووی ئەم پرسە لەلایەن تۆوە منی تووشی سەرسوڕمان کرد، ئایا دەتوانین چی بکەین تا کارەساتی شەڕ لە مرۆڤەکان دووربخەینەوە؟



لەسەرەتادا بێتوانایی من(خەریك بوو بڵێم بێتوانایی ئێمە) بۆ خستنەڕوو و لێکدانەوەی ئەم پرسە منی ترساند، چونکە بەبۆچوونی من ئەم کارە لەبازنەی کارە پراکتیکییەکانی فەرمانڕەوایانی دەوڵەتدایە. بەڵام پاشان تێگەیشتم کە تۆ نەك وەك سروشتناسو فیزیاناس، بەڵکە وەك لێکۆڵیاری قوتبناس؛ فریدیف نانسن(٦) کە بۆ چارەسەری کێشەی برسێتی لەجیهانداو یارمەتی مرۆڤە بێخانەوە لانەو ئاوارەو قوربانییەکانی شەڕی جیهانی هەموو توانای خۆی خستە ئیختیاریان، تۆش لەڕووی مرۆڤدۆستییەوە ئەم پرسەت خستۆتە بەرباس، لەمڕووەوە پێموایە چاوەڕوانی ئەوە لەمن ناکرێت کە لەمبارەیەوە پێشنیازی پراکتیکی بخەمەڕوو، بەڵکو تەنیا دەبێت لە سنووری چالاکی خۆمداو لەڕوانگەی دەروونناسییەوە دەربارەی کێشەی بەرگرتن لەشەڕ بدوێم.

تۆ لە نامەکەتدا تەنانەت لەم زەمینەیەشدا، تاڕاددەیەك هەموو پرسەکانت باسکردووەو کاری منت ئاسان کردووە. من تەنها درێژە بە وتەکانی تۆ دەدەمو بەوەوە دەوەستمو هەموو وتەکانی تۆ پەسەند دەکەمو هەوڵدەدەم بە زانیاریو گریمانەکانی خۆم، پرسەکان زیاتر فراوانبکەمو شیانبکەمەوە.

تۆ لە پەیوەندی نێوان مافو دەسەڵاتەوە دەستت پێکردووە کە بەبۆچوونی من باشترین خاڵی دەستپێکردنی لێکدانەوەکەی ئێمەیە. دەتوانم وشەی (دەسەڵات) بگۆڕم بە وشەی ناشیرینو توندوتیژی (زۆر)؟ ئەمڕۆ بۆ ئێمە مافو زۆر لە دژایەتیدان لەبەرامبەر یەکتریدا. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەکرێت بە سادەیی پیشان بدرێت کە (ماف) لە (زۆر)ـەوە دروستبووەو ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ بنەمای دروستبوونی پرسەکەو بە وردی سەیری



چۆنیەتی پرۆسەی گۆڕانکارییەکان بکەین، چارەسەری ئاسانە بۆمان. دەمبووریت کە بۆ روونبوونەوەی پەیوەندییەکان، ناچارم بابەتە گشتییە ناسراوو پەسەندکراوەکان لەژێرەوە وا بخەمە بەرباس کە گوایە تازەو نەزانراون. لەڕاستییدا ناکۆکی بەرژەوەندی نێوان مرۆڤەکان بەپەنابردن بۆ زۆر کۆتایی پێدێت، لە دنیای ئاژەڵاندا وایەو مرۆڤیش نابێت خۆی لەو دنیایە جیابکاتەوە. وەك بڵێی بۆ مرۆڤ ناکۆکی بیروباوەڕیش دێتە سەرو دژایەتی بەرژەوەندییەکان کە دەگاتە بەرزترین ئاستی دابڕانو بەشێوەیەك دەردەکەوێت کە کۆتایی پێهێنانی رێگە چارەیەکی دیکەی دەوێت. بەڵام ئەمە کێشەی دواتری ئێمەیە. لەسەرەتاداو لەسەردەمێکدا کە مرۆڤەکان بەشێوەی مێگەلی دەژیان، زۆرو توانای جەستەیی موڵکایەتیو کاریگەریتی رای کەسەکانی لەبەرەو پێشبردنی

کارداو ئەوەی کە چ شتێك هی چ کەسێکەو دەبێت پەیڕەوی لە ئیرادەو ویستی کێ بکرێت دیاریدەکرد. زۆرو توانای جەستەیی بەخێرایی جێگەی خۆی دا بە کەڵکوەرگرتن لە کەرەستەی بەرهەمهێنان. سەرکەوتن بۆ ئەو کەسانە بوو کە باشترینی چەکەکانیان لەبەردەستدا بوو یان بەباشترین شێوە دەیانتوانی کەڵکیان لێوەربگرن. لەگەڵ دروستبوونی چەکدا، بالاتر بوونی فیکر جێگەی زۆرو توانای جەستەیی گرتەوە. دوا ئامانجی خەبات ئەوە بوو کە کەسی بەرامبەر بەو زەرەرو زیانەی کە پێیدەگاتو بەلەکارکەوتنی هێزەکەی، دەست لە دژایەتی هەڵگرێتو چاوپۆشی لە ویستو داواکانی بکات. ئەم کارە کاتێك بەتەواوەتی دەگەیشتە ئەنجام کە سەرکەوتنی یەك لەدوای یەك بەسەر دەسەڵاتی بەرامبەو لاوازکردنی بەردەوام یان بە واتایەکی تر لەناوبردنو کوشتنی ئەو سەریبگرتایە. ئەم شێوازە



بۆ کەسی سەرکەوتوو دوو ئیمتیازی هەیە: یەکەم ئەوەیە کە دوژمن نەیدەتوانی سەرلەنوێ خۆی بەهێزبکاتەوە. دووەمیش ئەوەیە کە چارەنووسی دەبووە مایەی عیبرەت بۆ کەسانی دیکە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کوشتنی دوژمن دەبێتە هۆی تێربوونی یەکێك لە غەریزەکانی مرۆڤ کە دواتر لەبارەیەوە دەدوێم. دیارە لەناوبردنی دوژمن بەم پێیە دەکەوێتە ناکۆکییەکەوە، ئەگەر بێتو چاوپۆشی بکەیت لە کوشتنی دوژمنی ترساو، دەکرێت بیخەیتە خزمەت ویستەکانی خۆتەوەو کەڵکی لێوەربگریت. لەمڕووەوە هێزی سەرکەوتوو لەبری کوشتنی هێزی تێکشکاو، دەیکات بە ژێردەستەو گوێڕایەڵی خۆی. ئەمە قۆناغی دەستپێکردنی قۆناغی لێکبووردنو چاوپۆشیکردنە لە لەناوبردنی دوژمنو پاراستنیەتی، بەڵام لەلایەکی ترەوە کەسی سەرکەوتوو لەوە بەدوا بەردەوام لە

مەترسیدایە لەوەی کە دوژمنەکەی لەبۆسەدایە بۆ تۆڵە سەندنەوەو بەناچاری بەشێك لە ئارامیو ئاسایشی خۆی لەدەستدەدات.

بەڵێ؛ ئەمە بنەمای فەرمانڕەوایی دەسەڵاتە گەورەکانە، ئەو دەسەڵاتانەی کە تەنها پشتئەستوورن بەزۆر، یان هێزی زانستی خۆیان.

دەزانین کە لەم سیستەمانەدا بەرەبەرە گۆڕانکاریی هاتە ئاراوەو جۆرەکانی پەنابردن بۆ زۆر لەبەرژەوەندی فەرمانڕەوایی مافدا گۆڕدرا. بەڵام لە چ رێگەگەلێکەوە؟ بە بۆچوونی من ئەم گۆڕانکارییانە تەنها لەیەك رێگاوە دەکرا، کە ئەویش بە یەکگرتنی ژمارەیەکی زۆر لە هێزە لاوازەکان لەبەرامبەر دەسەڵاتە گەورەکاندا. (Lunon faitl aforce) دەکرێت لەڕێگەی یەکگرتنەوە، زۆر تێکبشکێنرێت. ئەم دەسەڵاتە یەکگرتووانە، نیشاندەری ئەو مافەن کە لەبەرامبەر زۆری



تاکەکەسی هەریەك لە کەسەکاندا دەوەستێت. دەبینین کە تەنها ماف، نیشاندەری دەسەڵاتی کۆمەڵگایەکە. ئەمجارەش زۆر بەهەمان ئامانجو ئامێر کاردەکاتو خۆی لەبەرامبەر کەسانێکدا دەبینێتەوە کە هەستاون بەبەرەنگاری. تەنها بەو جیاوازییەوە کە ئەمجارە شێوازێکی تاکەکەسی نییە، بەڵکو دەسەڵاتێکی کۆمەڵایەتییە. بەڵام تێپەڕین لەزۆرەوە بۆ مافی نوێ پەیوەستە بە مەرجێکی دەروونناسییەوە کە ئەویش: دەبێت یەکگرتنی گشتی؛ یەکگرتنێکی بەردەوامو هەمیشەیی بێت. ئەگەر ئامانج لەیەکگرتن تەنها خەبات بێت لەبەرامبەر هێزی باڵاترداو لەپاش سەرکەوتن هەڵوەشێتەوە، ئەوا هیچ کارێکی ئەوتۆ نەکراوەو ئەو هێزەی کە دواتر دێت هەر کە خۆی بە بەهێزتر دەبینێتەوە، هەوڵدەدات تا جارێکی تر دەسەڵاتی زۆر دابمەزرێنێتەوەو بەمشێوەیە ئەم

یارییە تا ئەبەد دووپاتدەبێتەوە. هاوپەیوەندی کۆمەڵایەتی دەبێت هەمیشە وەك خۆی بمێنێتەوەو خۆی ڕێکبخاتو یاساگەلێك دروستبکات کە پێشگیری لە زاڵبوونی سەرلەنوێی زۆر بکات چەندین دامەزراوەو ڕێکخراو دابمەزرێنێت کە پارێزگارو پاسەوانی یاساکان بێتو هەوڵبدات بۆ جێبەجێکردنی ئەو یاسایانەو مافەکانیان. لەگەڵ بە فەرمی ناسینی کۆمەڵگەیەکی وادا، ئەوتاکانەی کە ئەندامن لەو کۆمەڵگەیەدا هەست بە خۆیەتیو یەکبوون دەکەنو دەسەڵاتیان پشت بەم یەکگرتنە کۆمەڵایەتییە دەبەستێت.

پێموایە بەمشێوەیە، دۆخێك دێتە ئاراوە کە سەرکەوتن بەسەر زۆری تاکەکەسیدا لەڕێگەی گواستنەوەی دەسەڵات بۆ کۆمەڵەیەکی گەورە مومکین دەبێت، کۆمەڵگەیەك کە یەکگرتنی ئیحساسی ئەندامەکانی دەبێتە گرەنتی مانەوەو



بەردەوامبوونی. تەنیا شتێك کە دەمێنێتەوە جێبەجێکردنو درێژەدانە پێی. دیارە ئەم پەیوەندییە تا کاتێك کە کۆمەڵگا پێکهاتووە لە کەسانێك، بەدەسەڵاتو ئیمکاناتی بەرابەرەوە پەیوەندییەکە زۆر ساکار دەبێت. یاساکانی ئەم کۆمەڵەیە، ئازادییە تاکەکەسییەکانو هەروەها کەڵکوەرگرتن لە دەسەڵاتی تاکەکەسی دیارو سنووردار دەکات. تا لەسەر ئەو بنەمایە، پێکەوەژیانی تاکەکانی کۆمەڵگە دابینو مسۆگەر بێت.

بەڵام ئاساییشێکی بەو چەشنە تەنیا لە دنیای تیۆرییدا وێنادەکرێتو لە پراکتیکدا ئاڵۆز دەبێت. لەبەرئەوەی کۆمەڵگە لەسەرەتادا خاوەن تاك گەلێکە بەدەسەڵاتو ئیمکاناتێکی نایەکسانەوە. پیاوانو ژنان، باوکانو دایکانو ڕۆڵەکان، زۆریش ناخایەنێت کەلەگەڵ هەڵگیرسانی شەڕو گوێڕایەڵییدا

سەرکەوتووەکانو شکستخواردووەکان دەردەکەونو دەبنە ئاغاو خزمەتکار، هەربۆیە مافی کۆمەڵایەتیی نیشاندەری نایەکسانی ڕێژەیی دەسەڵات دەبێت. یاساکان لەڕێگەی دەسەڵاتو بۆ دەسەڵاتی فەرمانڕەوا دادەڕێژرێتو هەژاران خاوەن مافێکی کەمتر دەبن. لەئێستە بەدوا دووناوەندی سەرپێچیکردنو گۆڕانکاری یاسایی لە کۆمەڵگادا دروستدەبێت. یەکێکیان کەسانی دەسەڵاتدار دەگرێتەوە کە هەوڵدەدەن سنوورو چوارچێوە یاساییە دیاریکراوەکانی هەنووکە کە بۆ هەمووان بە بایەخە، لەبەرچاونەگرنو لە فەرمانڕەوایی یاساوە بگەڕێنەوە فەرمانڕوایی سەرلەنوێی زۆر. ئەویتریش کۆششی بەردەوامی هەژارانی کۆمەڵگەیە بە مەبەستی بە دەستهێنانی دەسەڵاتی زیاترو گۆڕانی ئەو یاسایانەی کە هەیەو لەگەڵ ئەوەشدا گەیشتن بە بنەمای یەکسانی یاسایی. ڕەوتی دووەم



بەتایبەتی کاتێك ماناو بایەخ پەیدا دەکات کە لە دەروونی کۆمەڵگەدا بەڕاستی ویستی گۆڕانی دەسەڵاتو گۆڕانکاری پەیوەندییەکان بێتە ئاراوە. ئەم کارە دەکرێت لە ئاکامی هۆکاری مێژوویی جۆراوجۆرەوە ڕوودەدات. لەم حاڵەتەدا، ماف بەرەبەرە خۆی لەگەڵ پەیوەندییەکانی دەسەڵاتی نوێدا ڕێکدەخات، یان ئەوەی کە چینی فەرمانڕەوا - بەوشێوەیەی کە زۆرجار ڕوو دەدات - بەم گۆڕانکارییە ڕازینابێتو ئەگەر لەحاڵەتێکدا کە هەردوو لایەنەکە پێدابگرن، شۆڕشو هەڵچوونو شەڕی ناوخۆ((شۆڕش)) هەڵدەگیرسێتو لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ماوەیەك یاساکان هەڵدەوەشێنەوەو زۆرانبازیی نوێ دەستپێدەکات کە بەجێگرتنەوەی سیستمێکی یاسایی نوێ کۆتاییپێدێت. دیارە گۆڕانی یاسایی بەڕێگەی ئاشتیخوازانەش بەدەستدێت. کە ئەم شێوازەش پێویستی بە دروستبوونی گۆڕانی

کولتوورییە لە ئەندامانی کۆمەڵگەدا. ئەم گۆڕانە کولتوورییانە پەیوەستە بەو هۆکارانەوە کە دواتر لەبارەیانەوە دەدوێم.

هەربۆیە دەبینین لەسنووری کۆمەڵگایەکیشدا چارەسەرکردنی ناکۆکی بەرژەوەندی بەیارمەتی زۆر مومکین نییە. بەڵام پێویستییەکانو لایەنە هاوبەشەکان کە بەرهەمی پێکەوەژیانن لەسەر گۆی زەوی، کۆتاییهێنانی هەرچی زووترو خێراتر بە ناکۆکییەکانو شەڕەکان فەراهەمدەکاتو لە دۆخێکی وادایە کە ئەگەری چارەسەری ئاشتیخوازانەیان بەردەوام زیاد دەبێت. بە چاوخشاندنێکی خێرا بەمێژووی مرۆڤایەتییدایە، دەبینین کە بەردەوام ناکۆکی بێکۆتا لەنێوان یەك یان چەند پێکهاتەی کۆمەڵایەتییدا، ناکۆکیی نێوان یەکە بچووكو گەورەکان، سنوورەکانی شار، ناوچە جۆراوجۆرەکان، نێوان خێڵەکان، گەلەکان، نەتەوەو



ئیمپراتۆرییەتەکان هەبووە کە زۆرجار بە تاقیکردنەوەی زۆرو شەڕ کۆتاییهاتووە. ئەمجۆرە شەڕانە یان بە تالانی یان رامبوونی تەواو و لەڕەگو ریشە دەرهێنانی لایەنێکیان کۆتاییدێت. دیارە ناکرێت وەکیەك داوەری لەسەر سەرکەوتنەکانی شەڕ بکرێت. هەندێك وەك مەغۆلەکانو تورکەکان تەنیا بوونە هۆی بەدبەختیو چارەڕەشیی. لەبەرامبەردا، هەندێك بە دروستکردنی یەکەی کۆمەڵایەتی گەورەتر، یارمەتیدەربوون لە هاتنەکایەی یاسا لەبری زۆرو ئیمکانی پەنابردن بۆ (زۆر)یان لەناوبردو بەدروستکردنی سیستەمی یاسایی نوێ، بوونەتە هۆی نەمانی ناکۆکی. بۆ نموونە سەرکەوتنی رۆمییەکان، بۆ وڵاتانی کەناری میدیترانە، (ئاشتی رۆمی)(٧) بەبایەخیان بە دیاریی هێنا، هەروەها ئارەزوو و مەیلی لەرادەبەدەر بۆ داگیرکردنی وڵاتان لەلایەن پاشاکانی فەرەنساوە،

ولاتێکی ئامادە بۆ ئاشتیو کۆمەڵگایەکی گەشەسەندووی بەرهەمهێنا. ئەگەرچی ئەم قسەیە ناکۆك دێتە بەرچاو، دەبێت ددان بەوەشدا بنێین کە شەڕ ئامرازێکی چاك نییە بۆ بەرقەرارکردنی ئاشتییەکی سەقامگیر کە ئێمە ئارەزوومەندانە بەدوایەوەین، لەبەرئەوەی کە دەتوانێت یەکەی گەورە دروستبکات کەلە سنووری ئەواندا دەسەڵاتێکی ناوەندی بەهێز، روودانی شەڕی نوێ نا مومکین دەکات. بەڵام لەراستیدا قابیلیەتی ئەم کارەشی نییە، چونکە ئاکامی سەرکەوتنەکان هەمیشە درێژەیان نابێتو یەکە نوێیەکان کە زۆرجار بەهۆی یەکگرتنێکی زۆرەملێی بەشە جیاوازەکان، بە زوویی یان خێرا لەیەکتر جیادەبنەوە. بەدەر لەمەش، تا ئێستا سەرکەوتنەکان تەنها توانیویانە یەکگرتنێکی جوزئی ـ هەرچەند بەرفراوان ـ دروستبکەن کە ناکۆکییەکانیان دواجار



بە پەنا بردن بۆ زۆر کۆتایی هاتووە. تەنها ئاکامێك کە لەتەواوی ئەم هەوڵو تێکۆشانە شەڕخوازانەدا بە دەستهاتووە ئەمەیە کە مرۆڤایەتی شەڕگەلێکی جۆراوجۆرو بچووك، بەڵام یەکلەدوای یەکی گۆڕیوە بەشەڕی کەم بەڵام وێرانکەرو ترسناكو گەورە.

لە ئێستاشدا، هەربەو چەشنەی کە تۆ بە کورتی ئاماژەتپێکردبوو، شێوازو ئەنجامی بەدەستهاتوو هەروەکو رابووردووە. لەراستییدا کاتێك دەتوانرێت بەتەواوی پێش بە روودانی شەڕ بگیرێت کە مرۆڤەکان بۆ جێنشینی دەسەڵاتی ناوەندییو لەبەرچاوگرتنی ئەحکامی ئەو لە هەریەك لە بوارە ناکۆکەکاندا، بگەنە رێککەوتنێکی بنەمایی. پێویستی هاتنەدی ئەم کارە پەیوەستە بە دوو مەرجەوە: مەرجی یەکەم؛ دروستبوونی وەها سەرچاوەیەکی بالا. مەرجی دووەم؛ سپاردنی دەسەڵاتی تەواوە بەو سەرچاوە(مەرجەع)ەو

هۆكارێكيش بەتەنيا ناتوانێت كارێكى ئەوتۆ بكات. لە ئێستادا (كۆمەڵەى نەتەوەكان) وەك سەرپەرشتيكارى كاروبارى ئەم چەشنە دەسەڵاتە ناوەندييە لەبەرچاوگيراوە، بەڵام مەرجى دووەم هێشتا بەراستى نەهاتۆتە دى. كۆمەڵەى نەتەوەكان بێهێزەو تەنيا ئەوكاتە دەتوانێت كە دەسەڵاتو ئيمكاناتى پێويست بەدەست بهێنێت كە ئەندامانى يەكێتى نوێ، واتا يەكبەيەكى وڵاتانى ئەندام وەها دەسەڵاتێك بدەنە ئەو. بەڵام لە ئێستادا هيوايەكى زۆر بە هاتنەدى ئەم كارە نييە. نەماندەتوانى لە كۆمەڵەى نەتەوەكان بگەين، ئەگەر نەمانزانيايە لێرەدا يەكێك لە ناوازەترين هەوڵو كۆششەكانى مرۆڤ، يان تەنانەت يەكەمين كۆشش، بە رەهەندگەلێكى بەم بەرفراوانييە دروستبووە. (كۆمەڵەى نەتەوەكان) كۆششێكە تا دەسەڵات، يان بەواتايەكى ديكە؛ ئەو كاريگەرييە رەهايەى كە



هەميشە پشت ئەستووربووە بە دەستەوەگرتنى دەسەڵات، بە پشتبەستن بە روانگە مەعنەوييە تايبەتييەكان بگوێزێتەوە بۆ خۆى. پێشتر وتمان دوو هۆكار دەبنە هۆى يەكگرتنو يەكانگيربوونى كۆمەڵگە: گوشارى زۆرو پەيوەندى ئيحساسى ئەندامان -كە بە زاراوەى فەننى پێيدەڵێن(وەكيەك لێكردن)- بەلەناوچوونى كاتى يەكەميان، رەنگە هۆكارى دووەم؛ كۆمەڵگە سەقامگيربكات. ديارە زۆر روونە تەنها ئەو بيرۆكانە جێگەى بايەخن كە دەربڕى گرنگترين لايەنە هاوبەشەكانى ئەندامانى كۆمەڵگە بن. ئێستا ئەو پرسيارە دێتەپێشەوە كە ئەو بيرۆكەو ئەندێشانە دەتوانن تا چ ئاستێك لەپەيوەندى ئيحساسيى ئەندامانى كۆمەڵگە كاريگەر بن؟ مێژوو فێرماندەكات كە ئەم ئەندێشانە خودبەخود كاريگەريى خۆيانيان داناوە. بۆ نموونە، بيرۆكەى يەكگرتنى يۆنان(٨) كە لەناوەندە

کولتووریی‌و سیاسییەکانی شارە جیاوازەکانداو لە پەرستگاو مەراسیمە مەزهەبیی‌و لە فێستیڤاڵەکاندا، لەچوارچێوەی جەختکردنەوە لەسەر بالاّتربوونی یۆنانییەکان بەسەر دراوسێ بەربەرییەکانیاندا دەردەبڕدرا، دەسەلاّت کاریگەرییەکی ئەوتۆی هەبوو کە توانی لەنەریتی شەڕخوازی نێوان یۆنانییەکان کەمبکاتەوە، بەلاّم دیارە هێندەش بەهێز نەبوو کە بتوانێت دەمەقاڵەی نێوان تاکەکانی نەتەوەی یۆنان لەناوبەرێت‌و تەنانەت نەشیتوانی کە ببێتە رێگرێك تا یەك شار یان کۆمەڵێك لە شارە یەکگرتووەکان، بۆ لێدان‌و زەرەرهێنان بە رکەبەری ناوخۆیی، لەگەڵ دوژمنی ئێرانییدا یەکنەگرن.

هەستی مەسیحیبوونیشیان بەو بەهێزیی‌و کاریگەرییە قوڵەی خۆیەوە، لەسەردەمی سەرلەنوێ ژیانەوەی کولتووریی{رێنیسانس}نەیتوانی رێگە لە



یارمەتیوەرگرتنی ولاّتە گەورەو بچووکە مەسیحییەکان بگرێت (کە لە دۆخی شەڕدا بوون لەگەڵ یەکدی) لە پاشا موسوڵمانەکان ، بەمەبەستی تێکشکاندن‌و زاڵ بوون بەسەر رکەبەری ناوخۆییدا. لەم سەردەمەشدا بیرۆکەیەك کە بتوانین چاوەڕوانییەکی ئەوتۆو هێندە بەدەسەلاّت‌و ئیعتیبارێکی گەورەی لێبکەین بوونی نییە. ئەوەی کە ئەمڕۆ پێداگرتنی نەتەوەکان لەسەر ئامانج‌و ئایدیالە نەتەوەییەکانی خۆیان، ئاکامی پێچەوانەو ئاوەژوو بەرهەمدەهێنێت، هێندە روون‌و ئاشکرایە کە پێویست بە روونکردنەوە ناکات. هەندێك پێشبینی دەکەن کە تەنها بڵاوبوونەوەو بەرفراوانبوونی بیری بەلشەفیکی دەتوانێت کۆتایی بە شەڕەکان بهێنێت، بەلاّم ئەمڕۆ تا گەیشتن بە ئامانجێکی وا، رێگەیەکی دوورمان لەپێشەو رەنگە گەیشتن پێی تەنیا پاش شەڕە ناوخۆییە

ترسناكەكان مومكين بێت. بەهەرحالّ؛ وا دێتە بەرچاو كە هەوڵدان لەپێناوی ئەوەی  كە دەسەڵاتی بیرۆكەكان بخرێتە جێگای ئەو دەسەڵاتەی كە ئێستا هەیە، لە دۆخی هەنووكەییدا رووبەڕووی شكستدەبێتەوە. هەڵەیە گەر لە هەڵسەنگاندنەكانماندا ئەوە لەبەرچاونەگرین كە بنەماو سەرچاوەی ماف لە بنەڕەتەكەیەوە تەنها زۆر بووە، هەربەوشێوەیەی كە ئەمڕۆش ماف هێشتا ناتوانێت چاوپۆشی بكات لە پشتبەستن بە زۆر.

ئێستا هەوڵدەدەم یەكێكی تر لە رستەكانت راڤە بكەم. تۆ سەرت سوڕماوە لە ئاسان ئامادەگی ئارەزوومەندانەی مرۆڤەكان بۆ شەڕو پێتوایە شتێك لە ناخی مرۆڤەكاندا سەرچاوەی ئەم كاریگەرییەیەو پاشان ئاماژەت كردووە بە غەریزەی نەفرەتو لەناوبردن كە كاری ئەم چەشنە هاندانانە ئاساندەكات. ئەمجارەشیان بێ هیچ كەموزیادێك



راوبۆچوونەكەت پەسەنددەكەم. ئێمە بڕوامان بە بوونی غەریزەیەكی وەها هەیەو لەم ساڵانەی دواییشدا هەوڵمانداوە، دەركەوتەو نیشانەكانی ئەم غەریزەیە بخەینە ژێر لێكدانەوەوە. ئایا دەتوانم بەم بۆنەیەوە بەشێك لە فێركاری غەریزە كە ئێمە لەدەروونشیكارییدا، پاش گەڕانو گومانێكی زۆر پەیمانپێبرد؛ لەگەڵ تۆدا باسبكەم؟ ئێمە وایدادەنێین كە غەریزە مرۆییەكان دوو جۆرن:

یەكەم/ ئەو غەریزانەی كە دەیانەوێت پارێزگاری لە نەفسو  یەكگرتنی ژیانی بكەن ــ ئێمە ئەم غەریزانە ناودەنێین (عیشقی) ــ رێك بەمانای چەمكی عەشق كە لە(میوانی) ئەفلاتووندا هاتووە، لەگەڵ بەرفراوانبوونی وشیارانە بەمانا رەشۆكییەكەی ئارەزووە سێكسییەكان.

دووەم/ ئەو غەریزانەی كە لەناوبردنو مەرگیان دەوێت. ئێمە ئەوغەریزانە بە كورتی ناودەنێین

غەریزەی شەڕانگێزیو غەریزەی وێرانکردن.

دەبینیت کە تیۆرییەکانی ئێمە لەڕاستییدا تەنها ئالۆگۆڕکردنی تیۆری رووبەڕووبوونەوەی عەشقو نەفرەتە کە ناوبانگێکی زۆری پەیداکردووەو رەنگە پەیوەندی سەرەتایی ئەوان بە جەمسەرگیری(هێزی راکێشەر)و (هێزی بەرگریکەر) بگات کە لە سنووری پسپۆڕیی تۆشدا رۆڵدەبینن. ئێستا مەهێڵە ئێمە بەم چەشنە خێرا لە هەڵسەنگاندنی چاكو خراپ تێپەڕین. هەریەك لەم غەریزانە پێویستەو دەرکەوتەکانی ژیان لەکاریگەری هاوبەشی دوولایەنەی ئەوانەوە دروستدەبێت. وا پێدەچێت کە هیچکام لەم غەریزانە ناتوانێت بە تەنیاو بەبێ ئەویدی چالاکی بکاتو هەمیشە هەریەکەیان تا ئاستێکی دیاریکراو هاوڕای ئەویدیکەیانە. بەوچەشنەی کە دەیڵێین: ئەم تێکەڵاوبوونەیە کە ئامانجەکە هاوسەنگدەکات یان لەهەر هەلومەرجێکدا



وادەکات بەو ئامانجە بگەیت. بۆ نموونە پارێزگاری نەفس بەدڵنیاییەوە لە غەریزەی عەشقەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵام هەر ئاشکراکردنی ئەم غەریزەیە ئەگەر بیەوێت بگات بەئامانجو مەبەستی خۆی پێویستی بەشەڕەنگێزییە. هەروەها غەریزەی عەشق بەهەر شێوازێك، بۆ گەیشتن بە مەعشوقە پێویستی بە غەریزەی خاوەندارێتییە. گرفتی جیاکردنەوەی کاریگەرییەکانی ئەم دوو جۆرە غەریزەیە، بۆ ماوەیەکی زۆر لەمپەرو رێگر بوو لەبەردەم ناسینی بوونی ئەوان بۆ ئێمە.

ئەگەر کەمێکی تر هاوڕاییم بکەیت دەبینیت کە رەفتاری مرۆڤەکان خاوەن ئالۆزی تایبەت بەخۆیەتی. زۆر بەدەگمەن دەتوانیت رەفتارێك بدۆزیتەوە کە تەنها لەژێر کاریگەریی یەك غەریزەدا بێت، چونکە هەر رەفتارێك خۆیلەخۆیدا بەچەشنێك خۆڕسکە، دەبێت تێکەڵەیەك لە

غەریزەی عەشق‌و وێرانکردن بێت. لەبنەمادا دەبێت پاڵنەرگەلێکی زۆر هاوکات ئاوێتەی یەکتر بن تا ڕەفتاری مرۆڤەکان مومکین ببێت. یەکێك لەهاوکارەکانی تۆ(پرۆفیسۆر گۆرگ کریستیڤ لیشتنبێرگ) کە مامۆستای دیاری فیزیا بوو لە زانکۆی گۆتینگن، پێشتر ئاگاداری ئەم پرسە بوو. ڕەنگە ئەو ئەگەر  دەروونناسێك بووایە ناوبانگ‌و ئیعتیباری زیاتری بەدەستبهێنایە تاوەکو فیزیاناسێك. بەهەرحاڵ؛ ئەو دۆزەرەوەی (هاندەری پاڵنەرەکان) بوو کە دەڵێت"هۆکارەکانی ئەو جوڵانەی کە ئێمە لەسەر بنەمای ئەو جوڵانە کارێك ئەنجامدەدەین، کە ئێمە ئەمڕۆ پێیدەڵێین -پاڵنەرەکان- دەتوانین هەروەك لاپەڕەی قیبلەنما دابەشیبکەین بەسەر سی‌و دوو بەشداو ناوەکانیش بە چەشنی هاوشێوە لەلای یەکترەوە دابنێین. بۆ نموونە (نان ـ نان ـ ناو یا ناو ـ ناو ـ نان)".



بەمشێوەیە، کاتێك مرۆڤەکان بانگدەکرێن بۆ شەڕ، پاڵنەری زۆر لە دەروونی ئەواندا دەبێت وەڵامدەرەوەی حەزو ئارەزووەکانیان بێت بۆ ڕۆیشتنە بەرەکانی شەڕو ڕازیبوونیان بە شەڕ، پاڵنەری مەزن‌و سووك، چاك‌و خراپەکان، ئەو پاڵنەرانەی کە بە دەنگی بەرز ڕادەگەیەنرێن‌و ئەو پاڵنەرانەش کە بەبێدەنگی دەڕۆنبەڕێوەو دەرنابڕدرێن. پێویستناکات ئێمە هەرهەموویان ئاشکرابکەین، بەڵام بەدڵنیاییەوە حەزکردن لەشەڕەنگێزی‌و وێرانکردن بەشێکە لەوان. ئەو وەحشیگەرییە لەڕادەبەدەرەی کە لەمێژوو وژیانی ڕۆژانەدا ڕوودەدات، بوون‌و توانای ئەوان دەسەلمێنێت. بە دڵنیاییەوە تێکەڵاوبوون‌و پێکهاتەی حەزو ئارەزووی وێرانکاری لەگەڵ ئەوانی دیدا غەریزە شەهوانی‌و مەعنەوییەکان، تێربوونیان ساکارتر دەکات. کاتێك کەسەیری کارەسات‌و

خوێنڕشتنەکانی مێژوو دەکەین، هەندێکجار وا دێتە بەرچاو کە پاڵنەرە مەعنەوی‌و رەسەنەکان تەنها بیانووی تێرکردنی حەزو ئارەزووە وێراکەرەکان بوون. خاڵێکی تر ئەوەیە کە ئێمە بڕوامان وایە، بۆ نموونە، لەکاتی روودانی وەحشیگەری‌و کرداری زاڵمانەی دادگاکانی پشکنینی بیروباوەڕی مەزهەبی، پاڵنەرە مەعنەوییەکان لە هۆشیارییدا جێگیربوون‌و بوونەتە هۆی ئەوەی کە سەرنجەکان بۆ لای خۆیان رابکێشن‌و پاڵنەرە وێرانکەرەکان بە چەشنێکی ناهۆشیارانە ئەوانیان بەهێزدەکرد. هەردوو بابەتی ناوبراو مومکینە.

پێموایە لەو پرسەی کە تۆ حەزت لێیە (بەرگرتن لە شەڕ) خراپ کەڵکمان وەرگرتووە نەك تیۆرییەکانی ئێمە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا حەزدەکەم کەمێکیتر غەریزەی وێرانکاریی شیبکەمەوە. غەریزەیەك کە هێندەی بە بایەخ‌و



گرنگە خۆشەویست نییە. ئێمە لە توێژینەوەکانماندا بە رامان‌و قوڵبوونەوەیەکی زۆرەوە گەیشتووینەتە ئەو ئاکامە کە ئەم غەریزەیە لە ناخی هەر بوونەوەرێکی زیندوودا کاردەکات‌و چالاکەو هەوڵدەدات بەرەبەرە ئەو بوونەوەرە زیندووە وێرانبکات‌و لێکیهەڵبوەشێنێتەوەو ژیان بگەڕێنێتەوە بۆ حاڵەتی توخمێکی بێگیان. بەڕاستی ئەم غەریزەیە شایستەی ئەوەیە کە ناوبنرێت(غەریزەی مەرگ). لەکاتێکدا کە غەریزەی عەشق‌و غەریزە شەهوانییەکان، ناسێنەری هەوڵ‌و کۆششەکانی ژیانن. غەریزەی مەرگ کاتێك دەبێتە غەریزەیەکی وێرانکەر کە بەیارمەتی ئەندامێکی تایبەت لەبەرامبەر شتێکی دەرەکییدا کەڵکی لێوەردەگیرێت. بە واتایەکی تر بوونەوەری زیندوو بە لەناوبردنی بێگانە پارێزگاری لە ژیانی خۆی دەکات، بەڵام بەشێك لە غەریزەی مەرگ لەناخی

بوونەوەرە زیندووەكەدا چالاك دەبێتو دەكەوێتەكار. ئێمە هەوڵمانداوە كە ژمارەیەك لەو دیاردە نۆرماڵو نەخۆشئاسایانە لەكاتی جێگیربوونی غەریزەی وێرانكاریی لە دەروون‌دا بخەینە روو. ئێمە تەنانەت چووینەتە دەرەوەی سنووری بیروباوەڕە باوەكانو هەوڵمانداوە دروستبوونو سەرهەڵدانی ویژدان لە سووڕانەوەی ناو بازنەی شەڕەنگێزییەكی وەهادا بۆناو ناخ روونبكەینەوە. دەبینیت كە ئەگەر پانتایی پرۆسەیەكی ئاوا لەرادەبەدەر بەرفراوان ببێتەوەو غەریزەی وێرانكاریی لەپانتاییەكی بەرفراواندا دەروونی بكرێت، بەهیچ شێوەیەك بێگرفتو كێشە نییەو بەجارێك زەرەرهێنەرەو دەرەنجامی خراپو ناخۆشی لێدەكەوێتەوە. لەكاتێكدا سووڕانەوە لەناو بازنەی هێزی ئەم غەریزەیەدا بۆ دەرەوە بەشێوەی وێرانكاریو لەناوبردن، باری ئەو بوونەوەرە زیندووە سوكتر



دەكاتو دەتوانێت كاریگەرییەكی باشی لەسەر ئەو هەبێت. لەڕاستییدا ئەم پرۆسەیە لە خزمەتی بیانووی بایۆلۆژیانەی هەموو هەوڵو كۆششەكانو كرداره ناشرینو ترسناكەكاندایە كە ئێمە دەمانەوێت لە دژیان خەباتبكەین. دەبێت ئەوە بڵێین كە ئەوان نزیكترن لە سروشتی مرۆڤ لە بەرگری ئێمە لەبەرامبەر ئەواندا كە تەنانەت دەبێت پاساو و روونكردنەوەش بدۆزینەوە بۆیان، رەنگە پێتوابێت كە تیۆرییەكانی ئێمە جۆرێكە لە میتۆلۆژیا(ئەفسانەناسی) كە تەنانەت دلگیرو شادیهێنەریش نییە. پرسیاردەكەم ئایا هەموو زانستە سروشتییەكان بەجۆرێك لە ئەفسانەناسی كۆتایی نایەت؟ ئایا فیزیا بەدەرە لەمە؟

بۆ درێژەی باسەكە، لەوبابەتانەی كە باسكرا تەنها هەرئەوەندە تێدەگەم كە ناكرێت هیوایەك هەبێت بە نەهێشتنی تەواوەتی ئارەزووە

شەڕەنگێزەکانی مرۆڤ. دەڵێن لە ناوچەیەکی چاكو خۆشدا لەسەر گۆی زەوی، هەندێك خێڵ هەن کە سروشت؛ هەموو ئەو شتانەی کە مرۆڤ پێویستی پێیەتی بەرادیەکی زۆر خستوویەتیە بەر دەستیانو بەدوور لەناچارییو زۆرو شەڕانگێزییو لەوپەڕی میهرەبانییو نەرمونیانییدا ژیان بەسەردەبەن. باوەڕکردن بەو پرسە قورسە بەلامەوە، بەڵام حەزدەکەم زیاتر ئاگاداری ژیانی ئەو مرۆڤە خۆشبەختانە بم. بەلشەفیکەکانیش هیوادارن بتوانن لەڕێگەی بەدەستهێنانو دابینکردنو زەمانەتکردنی پێویستییە مادییەکانو هەروەها دروستکردنی یەکسانی لەناو ئەندامانی کۆمەڵگەدا، شەڕەنگێزی لەناو مرۆڤەکاندا لەناوبەرن. بەبۆچوونی من هیوایەکی پووچو خەیاڵێکی لاوازەو هەوانتەیە. ئەوان لەئێستادا بەڕادەیەکی باش چەکیان لە بەردەستدایەو تەنانەت زەحمەتی



ئەوەش نایەن بەخۆیان کە پەیڕەوانی خۆیان لە رقەبەرایەتیو نەفرەت بەرامبەر بە ئەوانیدی بگێڕنەوە. لەمەش بەدەر؛ هەربەوجۆرەی تۆش ئاماژەتپێکردووە، ئامانجی ئێمە نەهێشتنی تەواوەتی ئارەزووە شەڕەنگێزییەکانی مرۆڤ نییە، بەڵکو تەنها دەبێت هەوڵبدرێت کە ئەم حەزو ئارەزووە بەچەشنێك رێنماییبکرێت کە لەشێوەی شەڕدا دەرنەکەوێت.

بەم شێوەیە لەفێرکاری میتۆلۆژیانەی غەریزەوە، رێگەو چۆنیەتی بەرگرتنو رێگرتنی ناڕاستەوخۆ لەشەڕ دەتوانرێت بە ئاسانی بدۆزرێتەوە. ئەگەر ئامادەیی بۆ شەڕ لە کاریگەرییە خێراکانی غەریزەی وێرانکارییە، وا دێتە بەرچاو کە دەتوانرێت یارمەتی لە رکەبەری ئەم غەریزەیە(واتە غەریزەی عەشق) وەربگرین. هەموو ئەو شتانەی کە دەبنە هۆی پەیوەندیو لێکنزیکبوونەوەی هەستیی نێوان

مرۆڤەکان، دەبێت لەڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ شەڕدا بەکارببرێن. ئەم پەیوەندییانە دەتوانن بە دوو چەشن بن: یەکێك لەسەر بنەمای پەیوەندی عاشقانە، تەنانەت ئەگەر بەبێ مەبەستو ئەنجامی کاری سێکسیش بێت. ئەوکاتە کە دەروونشیکاری لەبارەی عەشقەوە دەدوێت شەرمەزار نییە، چونکە دینیش دەڵێت"ئەوانی ترت وەك خۆت خۆش بوێت." ئەگەرچی بانگەشەکردنی ئاسانە، بەڵام ئەنجامدانی ئەستەمە. جۆرێکیتر لە پەیوەندی ئیحساسی لەڕێگەی هاودەردیو هەستی هاوخەمیو هەستی هاوپەیوەندی دێتە ئاراوە، ئەو لایەنە هاوبەشانەی کە هەوڵو کۆششێکی گرنگو پایەدار لەنێوان مرۆڤەکاندا دروستبکات ئیحساساتێکی هاوبەشو هاوخەمیو هاودەردیی بەدواوە دەبێت. بەشێکی گەورەی پێکهاتەی کۆمەڵگەی مرۆیی پشتی بەم لایەنانە بەستووە.



سکاڵاو گلەیی تۆ لە خراپکەڵکوەرگرتن لە دەسەڵات دەکەمە بیانوو تا ئاماژە بکەم بە یەکێکی تر لە ڕێگە ناڕاستەوخۆکانی بەرگرتن لە دەربڕینی ئارەزووی شەڕخوازانە. یەکێك لەلایەنە نایەکسانەکانی زاتییو نەگۆڕەکانی مرۆڤەکان ئەوەیە کە دابەشدەبن بەسەر دوو گرووپی رابەرو پەیڕەوکەردا. دەستەی دووەم (واتە پەیڕەوکەرەکان)زۆرینەیەکی گەورە پێکدێننو پێویستیان بەسەرچاوەیەکی بەهێزی دەسەڵات هەیە کە بتوانێت بڕیاریان بۆ دەربکاتو ئەوانیش زۆرجار بەبێ هیچ مەرجێك پەیڕەوی لێدەکەن.

لێرەدا پێویست بە بیرهێنانەوە دەکات کە دەبێت زیاتر لە رابردوو ئاگادار بینو وردبینیو کۆششێکی زۆر بەکاربەین تا ئەو مرۆڤانەی کەخاوەنی سەربەخۆیی فیکرییینو ناترسنو باکیان نییەو بەدوای حەقیقەتدا دەگەڕێن لە توێژە باڵاکانی

کۆمەڵگەدا پەروەردە بکرێن‌و ڕێبەرایەتیکردنی کۆمەڵانی خەڵکی پەیوەست‌و ناسەربەخۆ بدرێت بە دەستیانەوە. دیارە پێویست بە بەڵگەهێنانەوەو سەلماندن ناکات کە دەستدرێژیکردن‌و دەستتێوەردانی هێزە باڵاکانی دەوڵەت‌و بەرگرتنی فیکری کلێسا، لەبەرژەوەندی ئەمجۆرە پەروەردەکردنەدا نییە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، هەلومەرجی باش‌و پەسەندی کۆمەڵایەتیی پێکدێت لە خەڵکانێك کە ژیانی غەریزی خۆیان ملکەچ‌و گوێڕایەڵییەکی دیکتاتۆریی ورد کردبێت. هیچ هۆکارێکی تر، تەنانەت بەچاوپۆشیکردن لە پەیوەندی ئیحساسی جەماوەر، ناتوانێت یەکێتییەکی بەهێزی بەو شێوە تەواوو تۆکمە لەناو ئەواندا دروستبکات، بەڵام زۆر پێدەچێت کە هەلومەرجێکی وەها تەنیا هیوایەکی پووچ‌و خەیاڵپلاویی بێت. بە دڵنیاییەوە ڕێگای تریش بۆ



بەرگرتنی ناڕاستەوخۆ لەشەڕ هەیە کە پراکتیکیترەو زۆرتر گونجاوە، بەڵام ئەنجامێکی خێراشی نییە. مرۆڤ کەمتر بیر لە ئاشێك دەکاتەوە کە هێندە بەئەسپایی ئیشدەکات تا ئاردەکە بەدەست بێت، مرۆڤەکە لەبرساندا بمرێت، بەدەربڕینێکی تر مرۆڤ کەمتر بیر لە دەرمانکردنی پاش مەرگ دەکاتەوە.

دەبینیت کە لە بواری پراکتیکییدا، بۆ چارەسەرکردنی پرسە گرنگ‌و پێویستەکان، داواکردنی یارمەتی لە تیۆردانەرانی بێگانە بە جیهان ئاکامێکی ئەوتۆ بەدەستەوە نادات. باشتر ئەوەیە کە بۆ چارەسەرکردنی هەر پرسێك، خۆمان ڕووبەڕووی مەترسیی بکەینەوەو کەڵك لەو ئامرازانە کەلەبەردەستدایە وەربگرین. ئێستا حەزدەکەم لەبارەی پرسێکەوە بدوێم کە تۆ لە نامەکەتدا باست نەکردبوو. بەڵام بۆ من زۆر

گرنگو جێگەی سەرنجە. بەڕاست بۆچی ئێمە لەبەرامبەر شەڕدا تا ئەم رادەیە تووشی هەڵچوون دەبین؟ منو تۆو کەسانێکی زۆری تریش؟ بۆچی ئێمە بەشەڕ وەك هەریەکە لە گرفتە ئازاراوییەکانی تری ژیان رازینابین؟ ئاخر شەڕ وەك کارێکی سروشتی دێتە بەرچاو، هۆکاری بایۆلۆژی هەیەو بەهیچ شێوەیەك لەناوناچێت. لەم وتەیەی من نەترسیت! کاتێك دەمانەوێت لێکدانەوەی بابەتێك بکەین، رەنگە مافی ئەوەمان هەبێت کە بە دەمامکی شایستەییو بالاتربوون کەلەڕاستییدا نیمانە روخسارمان داپۆشینو لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا بڵێین: لەبەرئەوەی هەر مرۆڤێك مافی ژیانی هەیە، لەبەرئەوەی شەڕ ژیانی پڕ لەهیوای مرۆڤەکان دەفەوتێنێت، لەبەرئەوەی دیلو بەندکردنی مرۆڤەکان بچووكو سووكو زەلیلیان دەکاتو دەیاننێرێتە ئۆردوگاکان، چونکە بەپێچەوانەی



حەزو ئارەزووی خۆیەوە ناچاریدەکەن بە کوشتن، لەبەرئەوەی ئەو بەهاو بایەخە ماددییە گرانبەهایانەی کە دەستکەوتی هەوڵو کۆششو کاری مرۆڤەکانن، وێراندەکاتو لەناودەبات....هتد.

لەمانەش زیاتر؛ لەبەرئەوەی شەڕ لەشێوازە هەنووکەییەکەیدا ئیدی ناتوانێت ئامانجی قارەمانانی رابووردوو بێنێتەدیو لەشەڕەکانی ئایندەدا بەهۆی پێشکەوتنی ئامرازە مۆدێرەنەکانی شەڕەوە لەناوچوونی تەواوی یەکێك لەلایەنەکان یان هەردووکیانی بەدوادا دێت. هەموو ئەمانە راستەو هێندە حاشاهەڵنەگرە کە مرۆڤ سەریسوڕدەمێنێت بۆچی تا ئێستا کۆدەنگیو رێککەوتنێکی گشتی بۆ نەهێشتنو لەناوبردنی شەڕ دروستنەبووە. دەکرێت دەربارەی هەریەك لەم خالانە باسو گفتوگۆبکرێت.

بەلام ئەم پرسیارە دێتەپێشەوە کە ئایا کۆمەڵگاش بەرامبەر بە ژیانی تاکەکان نابێت مافی

هەبێت؟ ناکرێت لەبنەڕەتەوە هەموو شەڕەکان مەحکومبکرێن. تا ئەوکاتەی کە ئیمپراتۆرییەتەکان‌و دەسەڵاتەکان‌و نەتەوەگەلێك بوونیان هەیە کە بێبەزەییانە ئامادەی لەناوبردنی ئەوانی دیکەن، ئەوانی دیش دەبێت خۆیان بۆ شەڕ پڕچەك بکەن. بەڵام با بەخێرایی لەم بابەتە تێپەڕین، چونکە ئەمە ئەو باسە نییە کە تۆ مەبەستت بوو و منت بۆی بانگهێشتکردبوو. مەبەستی من شتێکی ترە، بەباوەڕی من هۆکاری سەرەکی هەڵچوونی ئێمە لەبەرامبەر شەڕدا ئەوەیە کە ئێمە جگە لەوە هیچ چارەیەکی ترمان نییە. ئێمە ئاشتیخوازین، چونکە بەهۆکاری ئەندامیی (ئۆرگانیکی) دەبێت وابین. هەربەم هۆیەشەوە ئاسانە بۆمان کە راوبۆچوونەکانمان بە بەڵگەهێنانەوە پاساوبدەین.

پێموایە ئەم تیۆرییە بەبێ روونکردنەوە



تێگەیشتن لێی ئەستەمە. لەخوارەوە هەوڵدەدەم مەبەستەکەم روونتر دەربڕم: پرۆسەی پەرەسەندنی کولتووری لەدێرزەمانەوە لەناو مرۆڤەکاندا درێژەی هەیە (دەزانم کەسانێك پێیانباشە ئەم پرۆسەیە ناوبنێین "شارستانییەت" ). لەڕاستییدا ئێمە هەموو شتێکمان بە قەرزداری ئەم پەرەسەندنە کلتوورییە دەزانین. ئەوەی کە هەین‌و ئەوەی کە نین، لەهەموو ئەوانەی کە کەڵکمان وەرگرتووەو لەهەموو ئەوانەشی کە رەنج‌و ئازاردەکێشین. بەرهەمی ئەم پرۆسەی پەرەسندنە کولتورییەیە کە هۆکارەکان‌و دەستپێکەی روون نییە، ئەنجامەکەش نادیارەو هەندێك لە تایبەتمەندییەکانی بەئاسانی دەبینرێت. رەنگە سەردەمێك ئەم پەرەسەندنە کولتوورییە؛ رەگەزی مرۆڤ لەناوبەرێت، چونکە کەمو زۆر زیانێکی زۆر لە کارکردنی ئارەزووی سێکسی دەدات، بەجۆرێك کە ئەمڕۆ زاووزێ لەناو

ڕەگەزە دواکەوتوو و چینو توێژە دواکەوتووەکانی کۆمەڵگادا، زیاترە تا لە نێو نەتەوەو توێژە کۆمەڵایەتییە ڕۆشنبیرەکاندا. ڕەنگە ئەم پرۆسەیە لەگەڵ ماڵیبوونی چەند جۆرێکی تایبەت لە ئاژەڵاندا بەراوردبکرێت. بێگومان پرۆسەی پەرەسەندنی کولتووریی لەگەڵ خۆیدا گۆڕانی جەستەییشی تیابوو، بەڵام ئەو بۆچوونەی کە پەرەسەندنی کوولتوریی هەمان (پرۆسەی گۆڕانی ئەندامی)یە هێشتا بۆ ئێمە نامۆیەو پێماننەگەیشتووە. ئەو گۆڕانکارییانەی لەگەڵ ئەم پەرەسەندنە کولتوورییەدا دروستبوون بەرچاوو ئاشکران. ئەم گۆڕانکارییانە لەگەڵ کرانەوەو گواستنەوەی ئامانجە غەریزییەکانو سنوورداریيەتی جۆشو خرۆشی غەریزیی هاوڕان. لەدەستکەوتە هەستەوەرییەکانی نەوەکانی پێشووی ئێمەدا زیاتر گەڕاون بەدوای چێژداو حەزو ئارەزووی سێکسیان



لە ئێمە زیاتر بووە، بۆ ئێمە بەچەشنی یەکسانو تەنانەت بەڕادەیەك کە تەحەممولیش ناکرێت. ئەوەی کە ویستە ئەخلاقییو جوانیناسییە ویستراوەکانی ئێمە گۆڕدراوە هۆکاری جەستەیی هەیە.

لەتایبەتمەندییە دەروونناسییەکانی پەرەسەندنی کولتووریی، دوو تایبەتمەندی بایەخی زیاتریان هەیە: یەکیان بالادەستبوونی عەقڵ کە زاڵبووە بەسەر ژیانی غەریزییدا، ئەویتریان بەدەروونیبوونی حەزو ئارەزووە شەڕانگێزییەکان لەگەڵ هەموو دەرەنجامە بەسوودەکانو هەموو ئەو مەترسییانەی کە بەدوایدا دێت. ئەو تێڕوانینە دەروونییەی کە پرۆسەی پەرەسەندنی کولتووریی سەپاندوویەتی بەسەر ئێمەدا، زۆر بە توندی دژی شەڕە. لەمڕووەوە لەبەرامبەر شەڕدا هەڵدەچینو ناتوانین تەحەممولی بکەین. ئەمە تەنها

دژایەتیکردنێکی عاتیفیو وەلانانێکی عەقلانیانە نییە، بەڵکو هەڵچوونی ئێمەی ئاشتیخوازو بێئارامییەکی زاتییە. وەك بڵێی حەساسیەتێکی بونیادییە لە توندترین حاڵەتیدا. لەڕاستییدا وا دەردەکەوێت کە ئەو سووکایەتییەی کە شەڕ بە جوانیناسی دەکات، کەمتر نییە لەو وەحشیگەریانەی کە مایەی بێزارییەو ئێمە دژی دەوەستین.

تاکەی دەبێت چاوەڕوانبین تائەوانی دیکەش ببن بە ئاشتیخواز؟ نازانم؛ بەڵام رەنگە هیوایەکی پووچو خەیاڵپلاوی نەبێت ئەگەر هیوداربین بە دوو هۆکاری کاریگەر کە لە ئایندەیەکی نە زۆر دووردا کۆتایی بهێنێت بە شەڕو شەڕخوازی: یەکێکیان تێڕوانینی کولتوورییەو ئەویتریان ترسێکی بەجێیە لە کاریگەریی و دەرەنجامی شەڕەکانی ئایندە. ناتوانین پەی بەوە بەرین کە ئەم رێگایە بە چ هەورازو نشێوو پێچو پەنایەکدا تێدەپەڕێت. لێرەدا



تەنها دەتوانین بڵێین: هەموو ئەو شتانەی کە یارمەتیدەری پەرەسەندنی کولتوریی بنو بەهێزیو خێرایی پێبەخشن، بێگومان کارکردێکی باشی دەبێت لەدژی شەڕ.

سلاوی لە دڵەوەم قبوڵ بکەو هیوادارم ئەگەر روونکردنەوەکانم روونکەرەوەی ویستەکانی تۆ نەبوون، بمبوریت.

**هاوڕێت: زیگمۆند فرۆید**

## یاداشتەکانی وەرگێڕی فارسی

Volker bund: بەو کۆششانەی کە تۆماس ویلسۆن بیستوهەشتەمین سەرکۆماری ئەمریکا لە ساڵی ١٩١٦وە دەستیپێکردبوو، دواجار لە شانزەی جەنیوەری ١٩٢٠دا (کۆمەڵەی نەتەوەکان) دروستبوو. لەسەرەتادا چل‌و پێنج وڵات ئەندام بوون تیایدا. پاشان چەند وڵاتیکی تریش چووونە ناوییەوە، لەوانەش : نەمسا لەساڵی ١٩٢٠، یەکێتی سۆڤێت لەساڵی ١٩٣٤، میسر لەساڵی ١٩٣٧، ئەڵمانیاش لەساڵی ١٩٢٦. جێگەی سەرنجە کە ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکا پەیماننامەی ئاشتی ڤێرسای کەساڵی ١٩١٩ بوو بەهۆی دروستبوونی کۆمەڵەی نەتەوەکان؛ قبوڵنەکردو نەبوو بە ئەندامی ئەم ڕێکخراوە.

بارەگای کۆمەڵەی نەتەوەکان لە جنێڤ بوو. ئەم ڕێکخراوە لەنێوان ساڵەکانی ١٩٢٠ تا ساڵی ١٩٤٦ز لە



بواری پاراستنی ئاشتی جیهانی‌و هاوکارییە ئابووری‌و کولتورییەکانی نێوان وڵاتە جیاوازەکان چالاکی دەنواند. لە چالاکییە گرنگەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکان؛ دەکرێت ئاماژە بکەین بە سنووربەندی لە ئوبەرشیلیسیۆن‌و چاودێریکردن بەسەر شاری ئازادی دانسیگ لە هەنگاریای ئێستادا. لەنێوان ساڵانی ١٩٢٠ تا ١٩٣٥و، بەڕێوەبردنی پارێزگای زارلەندی کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵی ئێستای لە ئەستۆدا بوو. کۆمەڵەی نەتەوەکان لەنەهێشتنی ناکۆکییدا بەچەشنێکی ئاشتیخوازانە سەرکەوتنگەلێکی بەدەستهێنا، بۆ نموونە لەساڵی ١٩٢١ ڕۆڵی هەبوو لە چارەسەرکردنی ناکۆکی نێوان یەکێتی سۆڤێت‌و دانیشتوانی دوورگەکانی ئالاند. بەچەشنێك کە ئێستا ئەم دوورگانە بەشێکن لە ناوچەی مەدەنی، بێلایەنن‌و خود موختارن‌و بەشێکن لە وڵاتی فینلەندا.

نەبوونی دەسەڵاتی تەواو بۆ بەرگریکردنی کاریگەر لەبەرامبەر دەستدرێژی‌و داگیرکاری‌و فراوانخوازیی دەسەڵاتی ژاپۆن، ئەڵمانیاو ئیتاڵیا بەشێوەیەکی بەرچاو لەبایەخی کۆمەڵەی نەتەوەکانیان کەمکردەوەو ئەم سێ وڵاتە لەساڵی ١٩٣٣دا لەم رێکخراوە چوونە دەرەوە. یەکێتی سۆڤیەت لەساڵی ١٩٤٠دا بەهۆی هێرشکردنە سەر فینلەندا لە کۆمەڵەی نەتەوەکان دەرکرا.

لەگەڵ دروستبوونی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لەساڵی ١٩٤٥، کۆمەڵەی نەتەوەکان کۆتایی بە کاری خۆی هێنا.

٢ـ ئەلبێرت ئەنشتاین لە دەفتەری بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەربارەی دەروونشیکاریی‌و بەرهەمەکانی فرۆید دەنووسێت" تاڕادەیەك لە نووسینەکانی یۆنگ تێدەگەم، بەڵام بێبایەخە، زۆربلێی کردووە، بەبێئەوەی کە هێڵێکی دیارو روون لە



نووسینەکانییدا هەبێت. باوەڕیشم بە فرۆید نییە بەڵام لانیکەم شێوازی نووسینەکانی سەرنجراکێشە بەڵام بیروبۆچوونی سەیرو سەمەرەی هەیە"

فرۆید لەبارەی ئەنشتاینەوە دەڵێت"راوبۆچوونەکانی ئەنشتاین لەبارەی دەروونشیکارییەوە دەزانم. چەند ساڵ لەمەوپێش بوارێك هاتە پێشەوە تا گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەودا بکەم‌و تێگەیشتم کە ئەو هەر بەو رادەیە شارەزایە لە دەروونشیکاری کە من شارەزام لە ماتماتیك. تەنانەت دەشتوانم بڵێم کە زانیاریی من لە بارەی ماتماتیکەوە زیاترە لە ئاشنایی ئەنشتاین دەربارەی دەروونشیکاری، لانیکەم من بڕوام بە حساباتی ماتماتیك هەیە، لەکاتێکدا کە ئەو دەروونشیکاریی بەگشتی پێقبوول نییە. پەسەندکردنی شێوازی نووسینەکانی من لەلایەنە ئەنشتاینەوە ئەوە نیشاندەدات کە ئەو مرۆڤێکی خاوەن بیروڕایەکی

باشە، لەلایەکەوە حەزدەکات من بناسێت‌و لەلایەکی تریشەوە هیچ لەگەڵ نووسینەکانم نایەتەوە، هەرلەبەرئەوەشە کە تەنها ستایشی شێوازی نووسینی من دەکات"

3- Zeitgemäbes über Krieg und Tod. In: Sigmund Freud. Kulturtheoretische Schriften. Frankfurt 1974

4- Warum Krieg? Albert Einstein. Sigmund Freud. Zürich 1972.

5- Internationales Institut für geistige Zusammenar- beit.

٦. (ئەنستیتۆی نێونەتەوەیی هاوکارییە مەعنەوییەکان): یەکێك لەو دامەزراوانەیە کەسەر بە (کۆمەڵەی نەتەوەکان)بوو. ئەلبێرت ئەنشتاین لەنێوان ساڵەکانی ١٩٢٢ تا ١٩٣٣نوێنەری ئەڵمانیا بوو لەم ئەنستیتۆیەدا. لەگەڵ کۆتاییهاتنی کاری(کۆمەڵەی نەتەوەکان)و لەپاش دروستبوونی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، رێکخراوی یونسکۆ



جێگەی(ئەنستیتۆی نێونەتەوەیی هاوکارییە مەعنەوییەکان)ی گرتەوە.

٦. Fridjof Nansen(فریدۆف نانسن) قوتبناس، زیندەوەرناس‌و دیپلۆماتی نەرویجی لەساڵی ١٨٦١ لە ئۆسلۆ لەدایك بووە. پاش شەڕی یەکەمی جیهان، لە ساڵی ١٩٢٠ بەرپرسیارییەتی گەڕاندنەوەی دیلەکانی شەڕی لە رووسیاوە گرتە ئەستۆ. لەساڵی ١٩٢١ تا ساڵی ١٩٢٣ یەکێك بوو لەبەرپرسە پایەبەرزەکانی (کۆمەڵەی نەتەوەکان) لەساڵانی ١٩٢١ تا ١٩٣٠ بزوتنەوەی یارمەتیدان بە برسییەکانی ناوچەکانی یەکێتی سۆڤێتی لەئەستۆدا بوو. لە ساڵی ١٩٢١ بەکۆششی ئەو (پاسپۆرتی نانسن) بۆ هەڵهاتووە سیاسییەکانی رووسیا دەرکراو پەنجاو سێ وڵات بەفەرمی ئەو پاسپۆرتەیان قبوڵکرد. ئەم پاسپۆرتە لەساڵی ١٩٥١ ناویدەرکرد بە (پەیمانی نێونەتەوەیی هەڵهاتووەکان) کە هەموو پەنابەرە سیاسییەکانی دەگرتەوە. نانسن لەساڵی ١٩٢٢ توانی خەڵاتی ئاشتی





نۆبـڵ وەربگرێـتو پـاش هەشـت سـاڵ لـه وەرگرتنـی خەڵاتەکە واته ساڵی ١٩٣٨ کۆچیدواییکرد.

٧. Pax Romana: بــەواتای (ئاشــتی رۆمــی)، (سلاوی رۆمی) یان (ماچی ئـاگرینی رۆمـی). لێـرەدا مەبەسـتی فرۆیـد ئـەو ئاشـتییه بـوو کـه لەسـەدەی یەکەمدا، لەسەردەمی ئاگۆستینیۆس که باڵی بەسـەر ئیمپراتۆرییەتی رۆمییدا کێشابوو.

٨. Panhellenismnus: ئــەو بزووتنەوەیــه بــوو که داوای یەکگرتنی یۆنانییەکانی دەکرد له وڵاتێکـی یەکگرتوودا.

